ناوی کتێب: شەماعیە - ڕۆمان
نووسینی: عەبدولستار ناسر
وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: سەباح ئیسماعیل
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٩٨٢
پیت لێدان: نۆژین سەباح
هەڵەگری: بۆکان نووری
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
بەرگ: مەریەم موتەقییان
چاپی یەکەم، هەولێر - ٢٠١٠
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان لە هەولێر ژمارە ٢١٩ی
ساڵی ٢٠٠٩ی دراوەتێ

## پێرست

## وتەی نووسەر بۆ دەقە وەرگێڕاوەکە

ئەم ڕۆمانە

شەماعیە، گەشتێکە بۆ شوێن و کاتی هەڵە، ئەم هەموو دەردیسەرییە لە پێناوی چی؟ ئەو دەمی نووسیم وشەکانی تام و چێژی تایبەتیان هەبوون، تاڕادەیەک لە گریان دەچوو، بڕوام نەدەکرد ئەوان ڕۆیشتن و قوڕبەسەرییەکە دووبارە نابێتەوە و شەماعیەش دەرگەکانی لە کات و شوێنی دروستدا دادەخرێن.

وەرگێڕانی ئەم ڕۆمانە بۆ کوردی شادمانی کردم، چونکە هەندێک لە ڕووداوەکانی لە کوردستانی عێراقدا ڕوودەدەن. حەزم دەکرد "شەماعیە" لە سرووت و سۆز و گرکان و ڕایەڵە و کەڵکەڵەکانی درێژتر و قووڵتر بوایا، کە هێنابوونمەوە، بەڵام تامە تایبەتەکەی، کە خەریکبوو بمهێنێتە گریان، بەرەو ڕازیبوون لەوەی کردوومە ڕاپێچی کردم، منیش بەئازارەوە لەگەڵ باڵەوانەکانمدا ملم نا، لە بەغدا و کوردستاندا نەهامەتییەک دەژیام لە نەهامەتییەکانی گشت ڕێگە و بیابانەکانی جیهان نەدەچوو.

شەماعیە شتێکی سەیرە، بەکاتێک نووسیم لە ژمنینی کەمانچە دەچوو، لەو دەمەدا نووسیم لە دەریایەکی تەزیودا مەلەم دەکرد، تەنیا چەند مانگێکی برد، هەینێ لە سەرەتای زستاندا پەنجەرەکەم خستە سەر گازی پشت، ڕۆمانەکە بەدوماهی هاتبوو، پەڕەکانی بەزامەکان تەڕ بووبوون، بەڕاستی مایەی سەرسووڕمانە، ئەمە یەکەمین ڕۆمانە لە ژیانمدا تێیدامۆسیقا دەژەنم و دەگریم، یەکەمین ڕۆمانیشە دەینووسم و لە دەرەوەی سنووری جەستەمدام، لە خۆم دەپرسم: ئەم هەموو نەهامەتییە لە پای چی؟

کەسایەتییەکانی ڕۆمانەکە شانبەشانم جەنگان، سۆزیان هەندێک لە سۆزەکانی من بوون، نوشوستییەکانیان بەشێکن لە نوشوستییەکانی من، سەیرترین شت لە شەماعیەدا ئەوەیە، گۆڕستان و بۆشایی و خەیاڵکردنەوە و تراویلکەیە، لە نێوان گۆڕ و ڤاڵاییەکانیدا ژیام، نە لە سەرابەکانیدا خەمم خوارد و نەیش لە خەیاڵکردنەکەم جاڕس بووم، لە کاتێکدا مۆسیقام دەژەند و وشەکانی دەیانهێنامە گریان. لەو دەمی نووسیم تژی بووم لەو بڕوایەی لە شوێن و سەردەمی هەڵەدام، تاکو زستانێکیان لە پەنجەرەی ژوورەکەمەوە خاترجەم بووم لێی بوومەتەوە و ناونیشانەکەیم بەهەڵە نووسیوە، ئیدی لە نێوان گۆڕستان و بۆشایی و خەیاڵکردن و تراویلکەدا هاوارم کرد: ئەم هەموو نەهامەتییە لە پای چی؟

عەبدولستار ناسر

٢٠١٠/٣/٢٣ عەمان

## پێشەکیی وەرگێڕ

لە ئەدەبی عێراقیدا بەتایبەت و ئەدەبی عەرەبییش بەگشتی، ئەستەمە باس لە چیرۆک بکرێت و ناوی عەبدولستار ناسر فەرامۆش بکرێت، ئەو بەیەکێک لە کۆڵەکەکانی چیرۆکی نوێی عەرەبی دەژمێررێت، لە ڕۆمانیشدا بەهەمان شێوەی چیرۆکەکانی گۆی گرەوی بردووەتەوە و ناوێکی دیاری کایەی ڕۆمانە.

ئەم ڕۆمانەی نووسەر "شەماعیە"(*) باس لەو کەس و هێزە کۆمەڵایەتییانە دەکات، کە ناخوازن ڕیتمی ژیان بەو شێوە قەتیسماوەی بەڕێوە بچێت.

خاڵی دەستپێکی ڕۆمانەکە لەگەڵ ڕۆژی کۆتایی هاتنی ڕێژیمی دیکتاتۆریی بەعسدا دەست پێ دەکات، لەم ڕۆمانەدا پێنج کاراکتەری سەرەکی بەشێوازێکی تۆکمەی هونەری ڕۆمانەکە بەڕێوە دەبەن، هەریەکە و کارەساتی تایبەت بەخۆی بەدەستی ڕێژیمی لەناوچووەوە دەگێڕێتەوە.

ئەدەبی زیندان لە عێراقدا زیاتر لە پاش ڕووخانی ڕێژیمی بەعس گوڕی بەبەردا هاتەوە، نووسەر لەم ڕۆمانەدا هەرچەند پەنای بۆ سەرچاوەی ڕاستەقینە بردووە و سوودی لێ بینیون، لە هەمان کاتدا کۆشاوە خۆی لە دیکۆمێنتاری و تۆمارکردن بپارێزێت، کەچی ئینجاش کە دەیخوێنیتەوە وا هەست دەکەیت ڕۆمانێکی ڕاستەقینەیە و کەسەکان تا ئێستا لە ژیاندا ماون. ڕەنگە سەرکەوتنەکەشی لەوەدا بێت چۆن چیخۆف بەخۆی سەردانی سیبیریای کرد، تاکو گیراوەکان و ئەوانی کاری قورسیان بەسەردا سەپێنراوە بەچاوی خۆی ببینێت، ئەمیش دەستەیێفسکی ئاسا بەخۆی

---

(*) شەماعیە: گەڕەکێکی ڕۆژهەڵاتی بەغدایە، گەورەترین شێتخانە لەوێدا کرایەوە، بەشێوەیەک ئێستا لە عێراقدا وشەی شەماعیە بۆ شێتخانە بەکار دەبرێت.

گرتیگەکانی ڕژێیمی دیکتاتۆریی بەعسی بینیون و ئازار و ئەشکەنجەی تێدا چێشتوون و دەزانێت لەوێ چۆن نەک هەر پیاوەتی، بەڵکو هۆش و بیریش دەخەسێنران.

ماوەتەوە بڵێم جێی خۆیەتی سوپاسی "هەدیە حسێن"ی ڕۆماننووس هاوسەری عەبدولستار ناسر بکەم، کە چەندین جار لە ئوردنەوە پێوەندیی تەلەفۆنی پێوە کردم و یاریدەی دام، چونکە مخابن نووسەر لە سۆنگەی شەپلەی دڵەوە دەستەکانی لە کار کەوتوون، بۆیە زۆربەی کارەکانی خۆی بەو سپاردوون، ئەو ئەرکی لە زاری نووسەرەوە وەرگرتنی پێشەکییەکەی لە ئەستۆ گرت و بۆی ڕەوان کردم.

سەباح ئیسماعیل

کەرکووک ٢٠١٠/٣/٢٣

## ئامارژەیەکی پێویست

کەسایەتییەکانی ئەم ڕۆمانە دەستکردی خەیاڵ و سەرکێشییەکانی نین، هەر یەکێکیان وەکو وێنام کردووە و لە بارەیەوە قسانم کردووە، لە بەغدا، یاخۆ پاشان لە شوێنانی تر، ژیانی گوزەراندووە. ناوەکانیان لێ دەرچێت، هیچ شتێک دروستکراوی دەستی من نییە. دەبوو من ڕۆمانەکە بنووسم (وەکو ئەوەی لە بەردەستتاندایە)، دوای ئەوەی ناوەکان لەبەر پاراستنی نهێنییەکانی هەر یەکێکیان، بەتەواوی دوور لە ناوی ئەوان هەڵبژێرراون، نەکو ڕۆڵە و نەوەکانیان (لە داهاتوودا) ڕاستیی ئەو ڕیسوایی و سەرکوت و سووککردن و پەراوێزخستنەی بەسەر کەسەکانیاندا هاتووە، پێ بزانن.

نامانەوێت گۆڕەکان هەڵدەینەوە، ئەوەندەی بەسەرماندا هات بەسە.

ع. ناسر

٢٠٠٥ عەمان

## ئەمین هاشم بەیتار

ڕۆژی هەڵاتنەکەمانم لە "شەماعیە" زۆر باش لە یادە، کە بەرەو ئاو و خواردن ملمان دەنا، ڕەنگە بەتوندی لێیان دابین، دووریش نییە گاڵتەیان لەگەڵدا کردبین، وەلێ برسییەتی بەهێزتر بوو، لەپەوڕوو خۆمان هەڵدایە چڵکاوەکانەوە، وێڕای ئەو تێڵاییانەی بەر سەر و دواوەمان دەکەوتن، ئاوەکە دەیبووژاندینەوە. وابزانم وەکو عەباسی باینجانفرۆش گوتی نۆی نیسان بوو، ئەو هەر بەخۆی کۆتەڵێک لە کۆتەڵەکان و دیواربەندێک لە دیواربەندەکانی ڕووخاند و سەمای دەکرد و گۆرانی دەچڕی و بەدەنگێک هەڵبەت ئێمە لێی نەدەگەیشتین، هاواری دەکرد، دەموچاوهەڵگر و زەماوەندی بێ سەرەوبەرە و مەیخانەی پڕ لە بووک و زاوا و نێرەمووک (عەباس ئەوە چی دەڵێیت؟).

سەرلەئێواری دنیا کشومات بوو، خۆم هاویشتە شوێنێکی لاچەپەوە، بەتەنیشت تەرمەکەی عەباسی باینجانفرۆشەوە، کە پارچە پارچە بووبوو و کۆ نەدەکرایەوە، دەخەنیمەوە. پسەپسێکی خامۆش، منداڵەکان لە حەوشەکەدا گەمەیان دەکرد، ڕەنگە یەکیان بە شەقێکی لە ناکاو بەسەر دەمدا بکەوێت، لە ڕێگەوبانەکاندا دەنگی مۆسیقا دەهات، بژی، کێ؟ نازانم، کەچی لەوبەری کۆڵانە ڕەنگ خۆڵەمێشییەکەی پێیدا تێپەڕیم، کەوت.

له بازاڕی کێچدا (داخۆ بازاڕێکی وا هەیە؟) گۆشتفرۆشەکە پارچەیەک نان و قەیماغ و نیو دیناری پێ دام، پاشان شەپێکی بەدواوەمدا کێشا و وەدەری نام:

- نەکەی جارێکی تر بێیتەوە ئەم ناوە.

له چاخانەی بازاڕی کوتاڵفرۆشان وردکەنانم له چایەکە هەڵدەکێشا و قەیماغەکەم دەلستەوە، گوێم بەخاوەن چایخانەکە نەدەدا، کە وەکو شێت دەخەنییەوە و بۆ ئەوەی دانیشتووەکان پێکەنن، ئاوی بەگیانمدا دەکرد.

گشت شەقامەکان خرۆشابوون، سەری منیش کاغەزێک بوو بەدەم باوە و خەڵتانی ترس بوو، بانیژەکان تژی بوون له ئافرەت، گوللەش بەر کۆشکەکان و ئەوانی ناوی دەکەوتن، شتێکی ڕاست لەو هەرا و هەنگامەیەدا هەبوو، هەرچەندە بانکەکان بەنوێژی نیوەڕۆ دەدزران، کەچی هەڵەیەک هەبوو لەمەڕ ئەو چەقۆیانەی بچووکەکان یارییان پێ دەکردن. خوێن دەڕژا و کەس گوێی پێ نەدەدا. چەندین ساڵ تێپەڕین و ئێمە بێ هۆ له "شەماعیە" بەخۆمان پێ دەکەنین. کڵاوەکان زیاد له پێویست گەورە بوون، کارەباش بەگیانماندا ڕێی دەکرد، دوای نیوەشەو قەپی بەگۆشتماندا دەکرد. شێتی چی له سیاسەت داوە؟ کۆمۆنیستێکی گومڕا، بۆرژوایەکی بۆگەن، ئاژاوەگێڕێکی مارکسی نیشانەی ڕەش بەتەوێڵیەوەیەتی. سەگ له بابێ سەگینە، بەرازینە له خوا ناترسن و "طريق الشعب" دەخوێننەوە، ئێمەش مافی خۆمانە میز بەسەر خۆیان و باو و باپیریان و ئەو ڕۆژنامانەشدا بکەین، کە دەیانخوێننەوە.

باشم لەبیرە چۆن له بەرەبەیانی نۆی نیساندا له شێتی دەرچووین و بەرەو سەرلێتێکچوون ملمان نا، له خۆشییاندا دەگریاین، بێشەرمانە بەپەنجە عەشقبازیمان لەگەڵ کیژە جوانەکاندا دەکرد، بەدوای تانکەکاندا ڕامان دەکرد و ئەوانیش پەیکەرەکانیان له بێخەوە هەڵدەکێشان، بەدووی ئەو قەلەڕەشە سەرکێشانەی بەحەلحەلەی ئاسمانەوە دەیانقیڕاند، هاوارمان دەکرد "الله اکبر"، بۆنێکی ناخۆش له بۆنی پیازی سووتاو دەچوو، لەگەڵماندا هاوشان بەرەو بەری ڕەسافە دەهات، جگەرەش چێژێکە سنووری نییە، هەرچەندە

ئەوان عەباسی باینجانفرۆشیان دایە بەر چەقۆ و لەتوپەتیان کرد، باشە بۆ؟ ئایا شێت مافی ئەوەی نییە شادمان بێت؟ داخۆ پەیکەر و دیواربەندەکان لە ژیانی مرۆڤ بەنرختترن؟ پاشان گرینگیی شەقامی رەشید چییە، ئەگەر سەدان ساڵ بێت هارِوون مردبێت؟ ئەی بەهای باینجان چییە، ئەگەر عەباس جێی هێشتبێن؟

مێشکم جەنجاڵە، بۆنی خوێن بەرێگەکانەوەیە، پیواز، سیر، گووی سەگ و پشیلە، بۆنی بەغدا دەکەم، ئەم شارە پێچراو لە رەشییە هێند رای کردووە دڵۆپ دڵۆپ ئارەقە دەرِێژێت، ئەوە یەکەمین جارم بوو بەغدا ببینم لە شوێنی خۆیدا رادەکات، چەندێک ئەو شارانەم خۆش دەوێن، کە لە رێگە عەباکەیان دادەکەنن، لەگەڵ باڵندەی فیسقەگولەی دەنووک کورتدا سەما دەکات، لەوێ لە ژوورەکەمدا دەهات بۆ لام، لەو دەمی بەنێو دارەوەنەکاندا دەفڕی، گۆشەگیرییەکەی سووک دەکردم، وای لێ هات ئەم باڵندە خوڵەمێشییە دەستەمۆ و هاودەمم بوو، رۆژ لە دوای رۆژ بووە نیشتەجێی ئەو دۆزەخە، بەرادەیەک دوای ماندووبوونی لە شکاندنی شووشەکە، دەنووک بەیەکدادان و نرکە و ناڵەیم دەبیست، لە تاریکیی شەویشدا لەسەر لقێکی تەڕی نزیکترین دەوەن لە دەستمەوە دەنووست، چون بیەوێت بیگرم، تاکو لە ژێر پەتووەکەمدا بنوێت.

میناکان خڕ شکان، هەروەها دەرکەکانی بەزمووڕەزم و ئامێرە کارەباییەکانیش، کە هەردەم ئێسکمانیان دەکرۆشت، وەکو گوللەی وێڵ دەرچووینە سەر شەقام و کۆڵانەکان، لە ناو کەلاوە و دارەوەنەکاندا لە باڵندەکە گەرِام، بینیم بەرەو گۆرِەپانی فیردەوس پێشم کەوتووە، لەوێ پێی گوتم: ئیتر پێویستت بەهاودەم نییە، پێویستە خۆت لە دومەڵی ئەو سالانە رزگار بکەیت، کەللەسەریان داخستبوویت. بینیم بێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە بەرەو باکور دەفری، ماڵئاوایی لێ کردم و رۆیی، بۆنی گۆگرد دەکەم، شتێک گری گرتووە، وابزانم بەغدایە، هەرچەندە خەڵکەکە لە خۆشییاندا هاوار دەکەن، کەچی لە خۆشی ناچێت، هۆ لەوێ منداڵێک سەری بەتاڵی مەیموونێک

ڕادەکێشێت، چووە لای کۆمەڵە زەلامێک سەرگەرمی سەماکردن بوون، سووتاندی، گۆرانییەک کە لە ماناکەی نەدەگەیشتم لە نێوان تانکەکاندا هەینێ بەهێورییەکی ترسناکەوە بەرەو گۆڕەپانەکە دەکشان، چەند بارە دەبوومەوە، شتێک دەسووتێت، منیش هیچ دەنگێکم نییە، بەجێهێشتنی باڵندەکە خەمباری کردم، تەنانەت ئاواتم خواست بگەڕێمەوە ئاگری ژوورەکەم بەو مەرجەی فیسقەگولەکە لەگەڵمدا بگەڕێتەوە و لە تەک دەستمەوە لە بان سەرینە خەڵتان خوێنەکەم بنوێت، لێ دنیا لەپڕ گۆڕا و باڵندەکانیش لە ترسی ئاگر و فڕۆکەکان بەغدایان جێهێشت.

***

فوارەی فرمێسک و نەمامی خەم هەموو ماڵێکی تەنیوەتەوە، ئەگەر ئەو ئەسرینانەمان خڕ بکردایەتەوە، کە لەسەر کوژراوەکانمان ڕژاون، ئەوا ڕووباری سێیەممان لە نێوان دیجلە و فوراتدا دەبوو، خێزانێک لە خوێن، یان ڕەنگە خێزانێک لە خۆڵەمێش، ئەمشەو چەند زەلام دەمرن و چەندان منداڵیان لە بەردەم دەرکەی کڵێسا و مزگەوتەکاندا تووڕداوە، عەشتەبای خوا لە ماڵاندا نییە، شیر لە مەمکی ژناندا چکی هێناوە:

– هۆپ هۆپ، تاسەیەک لە بەردەمتدایە.

وەلێ من هیچم نەدەبینی، جلەکانم بەچڵکاو پیس بوون، بۆنێکیان لێوە دەهات تابڵێی ناخۆش بوو، ژیان بووەتە (تاسەیەک)ی قووڵ، لای خوارەوە لە سەفوانەوە تاکو ئەوسەری مووسڵ، چاڵ و ئاوەڕۆکانی هەولێر پڕ بوونەتەوە، هەروەها بێستانەکانی دهۆک و گشت دارستانەکانی کوردستانیش کوێرەوە بوونە، خوا ویستی ژیان لەوێ بێت، هەر لەوێش بوو.

سەربازێکی ئەمەریکایی دەڵێت: سبەینێ دەگەڕێینەوە بۆ سان ستیڤانی، ئەم شەڕە دڵگیرەش دوایی هات.

بەر لەوەی بەخێزانەکەی شاد بێتەوە حوشترالووکەکان لە ژێر قیری شەقامەکانی شارەوە دەڕوانەوە، مار و مێروو و خشۆکەکان خۆیان دەپەستایە

تونی جری جله سەربازییەکانەوە، تێیاندا هەیە خۆی کوشتووە، ناکرێت هاوین و زستان لێرەدا بمێنیتەوە، خەڵکی چۆن لە شوێنێکی سەیری وادا دەگوزەرێن؟

پێنج منداڵ بەجلی دڕاوەوە بەدوامەوەن، من لەوان پۆشتەترم، نازانم چۆنیان قایل بکەم منیش وەکو ئەوان ئاقڵم و شێت نیم، شتێک نەبوو ئەوە بگەیەنێت، لەو ساتەی لە پرمەی گریانم دا دوور کەوتنەوە، ملم نایە مزگەوتی خولەفاوە، دوای ئەوە پتر لە دوو کاژێر ڕێم کرد، نەمزانی لەو ماوەیەدا چی بکەم، تەنیا ئەوەندە نەبێ دەست بەپیاسە بکەم، ئەم کۆڵان و ئەو کۆڵان بکەم و گوێ لە هەڵهەڵەی ئەودیو بانیژەکان بگرم، هەست بەڕووناکییەک دەکەم پێستم دەسمێ، هەرچەندە بەدەیان جار گریاندمی، شتێک لەگەڵ هەڵهەڵەکاندا دەسووتا، قیبلەنومای ماڵ، ماڵەکەم، دەزانم کەوتووەتە شوێنێکی ئەم بەغدایەوە، لە بەری ڕەسافە، لە شەقامی وەسی، لە نێوان (ئەبو دوودو) و (ئەبوسەیفەین)، وێڕای ئەوەی شوێنەکەم بیرچووەتەوە، لێ ژمارەکەی دەزانم، نەخێر، ئەوە منداڵیی من بوو، ماڵی من لەوێندەر لە عامرییەیە، تێکەڵییەک دەکەم لە نێوان منداڵی و لاوی و چوونە ساڵەوەدا، ماڵەکەم دوای سیازدە ساڵ ژیان لەگەڵ کارەبا و دەرزی لێدان و حەبی ورێنەکردن و (وەرە هەی کەری کوڕی سەگ)دا تا بەڕاستی خەریک بوو شێت بم، لە مێشکمدا سڕایەوە، ئەوان بەخۆیان دەیانزانی چ ئاقڵێکیان هێناوەتە شاری شێتانەوە.

من ئەمین هاشم بەیتارم، کە لە تەلەفزیۆن دەرچوو و گوتی:

– حزبی شیوعی بووە بەشێک لە ڕابردوو، لەسەر هاوڕێیانە بێ سەرێشە و دروستکردنی شتی بێ مانا خۆیان بدەنە دەستەوە، ئیتر هەموو شتێک تەواو بوو.

من شتی وام نەگوتووە، بەڵام دەنگەکە دەنگی من بوو، نازانم کەی و چۆن فڕێیان دامە هۆبەی ژمارە ٣وە و بۆچی شەوئاهەنگەکانیان لەگەڵمدا بەدەرزی ئاژن دەستیان پێ کرد و لەبەرچی بەکارەبا جەستەیان داخ دەکردم؟ گوێم لە وشەی شێت دەبوو لە گۆشەیەکی ژوورەکەمەوە بەر گوێم دەکەوت، شێت و

وێت، نەگبەت، سەگ، گوێدرێژ، دەی ئێستا بزەڕە:

– بزەڕە هەی کەرە.

لەبەرئەوەی نەمکرد، تا بەرەبەیان بەدیارمەوە مانەوە، خواردنەوە، جوێندان، بەقامچی پێستیان لە گیانم هەڵگرت، تا فێربووم چۆن ببمە ئەو کەرەی ئەوان دەیانویست. چەند جار وەڕیم و زەڕیم، تاکو وام لێ هات بوومە باشترین سەگ و گوێدرێژی دنیا، نازانم، دەنگی زەڕینەکەم لە گشت زەڕینێک بڵندتر بوو، لە ژوورە داخراوەکەی لای خوارەوە، لەو شوێنەی من تێیدا دەزەڕیم، بەدەم خواردنەوەوە هێند بەئەمین هاشم بەیتار دەخەنینەوە خەریک بوو دەپسان.

دەگریام، فرمێسکم بۆ پیاوەتیم دەڕشت، کە لێم داماڵرابوو، دەزەڕیم تاکو ئەو تەنگە ئەستوورە کورتەبالآیەی شەو نا شەوێک سەردانیی دەکردم و هەر جارەی لە پێکەنیندا (دەمرد) و (بەزەییی پێمدا دەهاتەوە) و لێ نەدەگەڕا بەر قامچیم بدەن، یاخۆ ئاگر لە نێوان ئێسقانەکانمدا بکەنەوە، تاکو گوێدرێژەکە زۆرترین کات بژێت.

مردن ڕەحمەتێکی گەورە بوو لێیان بێبەری کردم، تەنانەت ژوورەکەشم وێڕای بۆگەنییەکەی، شتێکی تێدا نییە یارمەتیی خۆکوشتنم بدات، فەرمانەکان وابوون من تا دوارۆژەکانی ژیانم لە ژێر باری سووکایەتیدا بمێنمەوە، تەنگە ئەستوورە گرگنەکە مرد و کورتەبالآیەکی تەنگە ئەستوورتر هات، وەلێ ئەمیان حەزی بەزەڕینی کەر نەبوو، بەڵکو چێژی لە توێ توێ بوونی پێستەکەمدا دیت، دوای چەندین مانگ لە ڕیسواکردن هەستم بەقامچییەکان نەدەکرد، هەینێ لەگەڵ خۆیدا پەیتا پەیتا لە مرۆڤبوون و کونیلەکانی دەبردم، تا وای لێ هات خوێن یەکسەر لە گیانمدا دەمەیی و منیش دەچوومە خەوی قووڵەوە، تاکو جارێکی تر جەستەم ئامادەیی بۆ پێشوازی کورتەبالآکە وەرگرێت، کە هەر بەسەرماندا دەسووڕایەوە، دەیگوت:

– برادەران ئامادەن؟

هەموو شتەکان لەم کورتەباڵا سەیرەدا گف و ڕاوەستاو بوون، قژی سەری، سینگپۆشە لۆکەییەکەی لەبەری دەکرد و شەرواڵە فشەکەی لە پێی دەکرد و بەدەورمدا دەسووڕایەوە، لە خوارەوە بۆ سەرێ گف بووبووەوە، شتێکی بڵندی تێدا نەبوو، جگە لە سەرە باریکەکەی نەبێت، کە لە سدارەکەی باپیرم دەچوو، هەر جارێک بهاتایەتە ژووری ئەشکەنجەدانەوە، لە دڵی خۆدا دەمگوت: گاڵتە و قەشمەریات هات.

ئینجاش لە جەلادەکەی پێشوو، کە ناچاری زەرینی دەکردم، زیاتر لێی دەترسام.

جارێکیان پێیان پێکەنیم، بەبرادەران، بێ ئاگا ئەمە ڕووی دا، تەنانەت نازانم بۆ خەنیمەوە، ئەوی لێی دەدام بە ئامـاژەیەک لە تەنگەئەستـوورەوە وەستا، نزیکەی کاژێرێک چاوەڕێم کرد، تا بزانم جۆری سزاکەم، کە لە دەمم دەرچوو، چییە؟ بەڵام شتێک ڕووی نەدا، تکام دەکرد کـورتەباڵاکە بێت و سزاکەی جێبەجێ بکات، کەچی وازی لێ هێنام، ڕۆیشت و هیچی نەگوت، هەندێک پەروەندی خستە بن هەنگڵییەوە، سەری هەڵبڕی و وەکو یەکێک بەپەیژەیەکی خەیاڵیدا سەرکەوێت و لە خۆی زیاتر کەس نەیبینێت، لێیدا ڕۆیشت.

دوای نیوەشەو بەرەو ژووری کارەبا پەلکێشیان کردم، نازانم چییان لێ کردم، تەزووەکانم لەبیرە چۆن گۆشتەکەیان دەسمیم، شتێکم بینی لە منارە دەچوو، بریسکەیەکی لە ناکاو و یەکێکی تریش زۆر گەرم، لەوی لەگەڵمدا ڕوو دەدات سەری گلۆڵەکە لە کوێیە؟ نازانم، کابرایەکی دەموچاو بەڵەک پێم پێ دەکەنێت، مەرمەڕ و قرمید و شتێلێک لە کوپی قاوە دەکەن، کابرای کورتەباڵای تەنگەئەستووری قژ گفم بینی، لەسەر شتێک دانیشتووە زیاتر لە سابوونێکی گەورەی دەکرد، لە شوێنێکی شێدار و ساردیان نابووم، نەمدەزانی لە دەوروبەرم چی ڕوو دەدات، ئەوەندە نەبێت سەرلەبەیانی خۆم لەسەر زەویی ژوورەکەمدا بینییەوە و ژێرم پڕ لە پەڵە خوێن بوو، بیرم کەوتەوە داریان تێ بریوم و خۆشبەختانە دەمودەست بووراومەتەوە، لەو کاتەدا

تێگەیشتم کەسێک هەیە دەمبینێ و لە کەڵبەی تەنگەئەستوور و چەپۆکی (برادەران)م ڕزگار دەکات.

***

شەیتانێکی نەفرەجای ڕەش، چوارمشقی لە ناو سندووقی مێردەزمەکاندا دانیشتووە، بەدرێژیی شەو چاوم تێ بڕیوە، بەترس و سام فریوی دەدەم، من لە تەنگوچەڵەمەدام، گەمەیەکی سەیرە شەیتانی خۆت خۆشبوێت و دەرگەی بۆ بخەیتە سەر گازی پشت و پێی بڵێیت (ئەی پیاوی گەورە، فەرموو لەسەر کورسیی دەسەڵاتت دانیشە) بەدرەفتاریش بەتەنیشت دەستەکانمەوە دانیشتووە، خواوەندی بێ ئومێدی و ناتەواوییەکان لەسەر زەوییەکە بەتەک هەناسەبڕکێ پڕ ژانەکانتەوە نووستووە، دڵم شەکەت و ماندووە، لەم دنیایەدا هەموو شتەکان لەسەر دوو پێ دەڕۆن تەنیا جەستەی من نەبێت، ئەمین هاشم بەیتار جگە لە تەرمێک هەناسە دەدات هیچی تر نییە، پتر لە حەوت ڕۆژ بێ خواردن جێیان هێشتم، وەکو بەندۆڵی دەمژمێر لە دەرکەیان دەدام، بەردەوام بوون، منیش دەملووراند و هاوارم دەکرد: خوا لێتان ڕازی بێت بەسە ئیتر.

کەچی دەرکە ئاسنینەکە هێشتان لە ژێر لێدانی بێ وچاندا دەینالاند، ڕوحی دەرهێنام و ئێسکوپرووسکی وردوخاش کردم و وای لێ هات مێشکی دەکرۆشتم، ترس شێوەی پێچاوپێچ، گێژوگەواڵ و جیاجیا وەردەگرێت، هەر جارێک و سیمایەکی هەیە لەوی دوێنێ ناکات، ئەوی سبەینێیش وا نابێت، دەمێک توورم دەدەنە ژوورێکەوە جگە لە من کەسی تێدا نییە، لەگەڵ مۆسیقایەکی گڕ و ناساز ڕوح و ئاوەز تێک دەدات، پەنجە پەستانە گوێش سوودی نییە، نە خەوم لێ دەکەوێت و نە هیچ شتێکیش لەگەڵ ئەو دەنگەدا داد دەدات، کە دەمخاتە نێوان چەکوشێک لەلای چەپ و یەکی تر لای ڕاستەوە، دەمێکیش بێ ئاو و خواردن جێم دەهێڵن، جارێکیش دەمهێنن و دەمبەن و دایک و باوک و براکان و ئەژدادم جوێنباران دەکەن.

***

لە مزگەوتی خولەفا بەخۆم گوت: من ئەمین هاشم بەیتارم، سەرم نایە ژێر

بۆرییەکەی وەکو باران ئاوی لێ دەهات، هەستم بەبووژانەوە کرد، شتێک دەکزایەوە، ئەوە پێستەکەم بوو لە ژێر قامچیدا هەلا هەلا بووبوو، لە خۆم دەپرسم:

– چۆن دەتوانم بگەڕێمەوە ناو خەڵک و ئاوەزم لە نێوان نیوەڕۆ و ئێواریێ و برسییەتیدا پارچە پارچە بووە؟ ئەگەر هەندێک پارەم دەبوو، ڕەنگە بمتوانیبایا جلکی پاک و پوختە بکڕم، هەر سەرتاشێکی کۆلانیش دەیتوانی ریشم، کە بەدرێژاییی سالانی زەڕین و وەڕین درێژ بووە بتاشێت، لەوانەیە بگەڕێمەوە ناو خێزانەکەم، ئەگەر تاکو ئێستاکێ لە هەواڵی کوڕەکەیان دەپرسن، کە چەندین ساڵە مردووە، چونکە ماقووڵ نییە دوای ئەو هەموو گەڕان و تەشەبوز و پرسیارکردنە لە بەڕێوەبەرایەتییەکانی ئاسایش و هەواڵگری و نەخۆشخانەکاندا (هەڵبەت هەر دەبێت پرسیاریان کردبم)، بەزیندوویەتی مابم (وەکو چاوەڕوانن).

لە دنیا و ئەوی تێیدایە دایان بڕیم، جگە لەو گوێدرێژەی دەزەڕی و فرمێسکی بۆ ئەو ڕوحەی دەڕشت، کە بەبەرچاوییەوە نایانە ژێر پێوە، پێویستم بەمشتێک پارەیە، تاکو جیهان ڕازی بکەم، کە ئەمین هاشم بەیتار هێشتا لە بەغدایە و ئەو تالان و بڕۆ و شکان و مردنانەی ڕوو دەدەن بەچاوی خۆی دەبینێت، بەلام ئاوەزم پرشوبلاوە و ڕەنگە ماوە نا ماوەیەک ببێتە هەلم، لەگەڵ خۆمدا قسان دەکەم و بەوەی ڕووی دا دەخەنمەوە، کەس نامناسێت، واتا کەس ناتوانێت بڕوا بەوە بکات، کوڕەکەی هاشم بەیتار لەوێ لە ژێرزەمینەکانی ترسدا سەرنەبڕاوە، کەس نییە لەگەڵیاندا ڕۆیشتبێت و گۆشت و ئێسقانی لە ژێرزەمینەکانی مەرگدا پرشوبلاو نەبووبێتنەوە، ئەی کەواتە من چۆنیان پێ بڵێم:

– من ئەمین هاشم بەیتارم.

پاشان ئاوەزم بەقسەی هەڵەقوبەڵەق و شێتانە دەمشکێنێتەوە، ئەوان خاترم دەگرن و منیش پاڵەوان ئاسا دەیڵێم؟

دانی پێدا دەنێم من نیوە شێت، یاخۆ نیوە وشیارم، من خۆم بەمە دەزانم و پێویستم بەتاقە کەسێکە بڕوام پێ بکات و لە ڕاستیی ویژدان و جۆری ئەو دۆخەم بگات، کە من پێی گەیشتووم، ڕەنگە پێویستم بەیەک کاژێر بێت تێیدا زیاتر لەسەرخۆ بم، تاکو ئەوی لەوێ ڕووی دا لە حەبی وڕێنە و بزرکاندن و زەڕینی کەر و وەڕینی سەگ و وایەری کارەبا و ئەو دەرزییەی شەو و ڕۆژ قەپم پێدا دەکات.. جەمەدانی و بیبەر و لەگەنی قسعەی سەربازەکان، فاسولیا و پالتۆی دڕاو و سەردانەواندنیان بۆ بگێرمەوە. لەشەفرۆشێک و لە زستاندا جلەکانی لەبەر دادەماڵرێت، جەنگەڵێک لە خواردنەوە و بەدمەستان، ئەستەمە بتدۆزنەوە ئەمین، جگە لە مۆتەکە هیچ پەتوویەکت بەسەردا نەدراوە، لە سەرخۆشانی درەنگوەختیش زیاتر، کە لە خۆت شێتترن، کەس لێت نزیک نابێتەوە، تەنانەت خۆشیان لە کاتێکدا بۆنی خواردنەوەی هەرزانبەها لە دەمیانەوە دێت و لەو شوێنەی لێی دەنووی بەبۆن هەراسانت دەکەن، وەکو تۆ لە ژێر پەردەکاندا دەست بەزەڕین دەکەن.

فێرنەبووم چۆن دەست لە خەڵکی پان بکەمەوە، بەڵکو ئەمە خوایە یەک دوو عانە خڕ بکەمەوە خۆم لە قەوزەی شەماعیە و دڕکوداڵەکەی دەتەکێنم، هەروەها لە شێتییەکەی کە چووەتە ناو دەمارەکانمەوە، پاک بکەمەوە. ئەو سەرخۆشەی لە نزیکمەوە دەنوێت لە کاتی داکەندنی پالتۆ قورسەکەیدا چەند دینارێک و بلیتێکی یانسیبی لێ کەوتن، چ گەمژەیەک بڕوا دەکات پارە لە ڕێگەی نیوە بلیتێکی ئارەقاوییەوە، کە ژمارەکەی خەریکە دەدڕێت، بێتە دەست؟!

جەستەم پەستراوەتەوە، کەچی پانتایی وەکو نۆکەرێک لە خزمەتمدایە، من سەرخۆشم و لە هەمان کاتدا خەوم نایەت، بەترسێکی زۆرەوە پەنجەم بۆ دینارێک لەوێ و ئەوی تر هێشتا بەگیرفانی پالتۆکەیەوە نووساوە، درێژ دەکەم. ئەگەر وا بمێنمەوە لە برساندا دەمرم، هەینێ گزنگی دا پەردەکەم جێ هێشت و لە ترسی ئەوەی نەکو کابرای بەدمەست بێدار بێتەوە، ئەو سێ دینارەی لە ماوەی بێ هیواییەکەمدا کۆم کردبوونەوە، هەڵگرت و غامم دا.

دوور نییە ئەگەر پارەکانی بەدەستمەوە ببینێت، بمکوژێت. سێ هێلکەم بەعەنبە و فەلافلەوە خوارد، لەگەڵ سێ کولێرەی سووتاو، خەریکە شێوەی نانی سپیمان بیر دەچێتەوە، دوای ئەوە لە گۆڕەپانی تەیەراندا چایەکەم لە تەنیشت پیرەژنێک خواردەوە، گوتی:

– سبەینێ لە هەمان کاتدا وەرەوە، تاکو سیپاڵی پیاوە کوژراوەکەمت پێ بدەم.. کابرا ئەگەر زستان ئاوا بمێنیتەوە دەمریت.

***

جلەکانی مێردەکەیم وەرگرت، کە لە دار درابوو، بێ ئەوەی پیرەژن بزانێت لەسەر چ تاوانێک فرێیان دایە بەر مەرگ، وەلێ لەوە دەچێت ڕێکپۆش و لاواز و زەوقێکی جوانی هەبووبێت، ئەمەش بەئارامی گەڕاندمییەوە بۆ بەشێک لە خۆم، کە تێکشکابوو و هیچم لەبارەی سیما شاراوەکەیەوە نەدەزانی.

من بۆ پیاوەکەی دەگریام، هەرچەندە ئەو باش دەیزانی من بۆ خۆم دەگریم، پیرەژن، کە لە گۆڕانی لە ناکاوی من زەندەقی چووبوو، پێوەندییەک هەبوو خەریک بوو ئاگری دەگرت و کڵوکۆی دادەمرکایەوە. سەرم لێ شێوابوو ئیتر چی بەدەممدا دەهات، کام وشە پیسە هەڵم دەهێنایەوە، پاشان وەکو مەیموونێک ئاگر لە کلکی بەربووبێت، هارئاسا دەکەوتمە بازبازۆکێ، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ ئاسەواری ترسی پێوە دیار نەبوو، متەقیشی نەدەکرد. وێڕای ئەمانەش نەترسا و هیچی نەگوت، بەڵکو دوای ئەوەی هاتمەوە سەرخۆم قسەکەی تۆقاندمی:

– وادیارە تۆشیان بۆ ئەوێ بردووە.

بەدڵێکی پڕ لە ژانەوە گوتم:

– بۆ کوێ؟

بەسەری دانەویوییەوە گوتی:

– ئەوێ، ئەو شوێنەی کورەکەمی بۆ چوو، جیاوازیتان لە نێواندا نییە، ئەوەندە نەبێت ئەو نەگەڕایەوە، ڕەنگە بۆ بینینی باوکی چووبێت، لەمەشدا

کارێکی باشی کردووە، چونکە ناکرێت لە وڵاتێکی وادا بمێنیتەوە، بەغدا بووەتە وردەواڵەفرۆش.

بەتەنیشت دەستەکانییەوە کەوتمە سەر زەوییەکە، پاش ئەو هەموو بێدەنگییە بەسەر گوێدرێژە زەندەقچووەکەوە، لەوە ترسام گەرووم بکەوێتە زەرین.

## سەفییە

لەسەر خواستی باوکم بۆ ئەوەی ڕووڕەشییەکەم داپۆشێت چوومە شەماعیەوە، دە هەزار دینار (بەرتیل)ی دایە ئەو بەڕێوەبەرەی سەراسوێیی شوێنەکەی دەکرد، ئەویش دوای ئەوەی سێ حەبی سووری دامێ، هەر لە یەکەمین شەودا دەستدرێژی کردە سەرم، سبەینێ بێدار بوومەوە زانیم بەڕێوەبەر کاری خۆی کردووە، لە تاقە ڕۆژێکدا جەستەم و هەزار دینار.

کەچی لە دووەمین شەودا هەواڵی دامێ (من پاکیزەم)، یانیش بەر لە چوونم بۆ هۆبەی ژمارە ٩ من وابووم، پێم گوت:

– دەزانم، وەلێ براکەم هەینێ لەگەڵ کوڕە دراوسێکەماندا بینیمی ویستی بمکوژێت، بابیشم هیچی بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێت بەتۆمەتی شێتی لە کوشتنم قوتار بکات، ئەوەتا تۆش تەڕت گرتێبەردا، دوای ئەوەی وشک سووتا.

پزیشکی نیشتەجێ گوتی:

– داوای لێبووردن دەکەم، ئەگەر بمزانیایا کون نەکراویت لاقەم نەدەکردیت، من کەمتیار نیم، ئەمە یەکەمین جارە گوناهی وا دەکەم، بەڕاستی داوای بەخشین دەکەم.

گەیشتە ئەو باوەڕەی من شایانی ئەوە نیم لە نێو شێتاندا بمرم، زۆری یارمەتی دام، ئیتر بەدرێژایی ڕۆژ کارم لەگەڵدا دەکرد، تەنانەت تا دوای نۆی نیسانیش ئەو ڕۆژەی شێتەکان بەرەو شەقامەکانی دواوە بەئالی ڕووبارەکەوە لە پشت کۆشکەکانەوە هەڵاتن، یەکیان خۆی خستە ژێر زنجیری زرێپۆشی ئەمەریکییەکانەوە، تا لە بەهێزییەکەی دڵنیا بێت، یەکی تریش ویستی سیپاڵەکانی لە تەنیشت کۆشکی کۆماری بشوات، ئەمریکییەکان جلێکی

سەربازییان پێ دا و لە پێکەنیندا مردن، ئەو دەمی دەستی بڵند دەکردەوە و دەیگوت:

- های هیتلەر.

لە هۆبەی نۆیەم بەرە و ئەو تارماییيانەی لە ڕێگەوبان سەمایان دەکرد، دەرچووم، نازانم بۆ کوێ مل بنێم؟! نە خزمێک نە کەسێک، دە ساڵە من لەگەڵ پەتیاراندا دەسووتێم، تەنانەت لە نێوانیاندا ئاوەزیشم بیرچووەوە، براکەم، کە لە سۆنگەی ئەوەوە بابم تووڕی هەڵدامە ئەو نەخۆشخانەیەوە، لە تیرەی مرۆڤ نەبوو، ئەو لەپێناوی دینارێکدا هەموو شتێک دەکات، تاکو بیدات بەمادەی بێهۆشکەر و مەی و ئافرەتی لەشفرۆش لە ماڵە نهێنییەکاندا، ئەو خۆی لەشفرۆشە، ئەگەر بشێت ئارەزوو بەگەنجێکی پاشەڵپیس دەفرۆشێت، کە چ شتێک دەربارەی ژیان نەزانێت، تەنیا ئەوەندە نەبێت دەرفەت و دەسکەوت و بەخەڵک ڕابواردنە، ئەگەر لە هەر پلە و پایەیەکدا بێت.

هەموو کات چەقۆ لە گیرفانی پانتۆڵەکەیدا بوو، کەنگێ بیویستیا دەیوەشاند، هەر کاتێک کە زیانی وێکەوتبا. ئەو ڕۆژەی لەگەڵ کوڕە دراوسێکەماندا بینیمی، لە هیچمان تووڕە نەبوو، بەڵکو لە زیانکردنەکەی تووڕە و تۆسن بوو (خوشکەکەی بەخۆڕایی لەگەڵ یەکێکی دیدا دەڕوات).

دەزانم ژیان لە ناو خێزانەکەمدا شێوەیەکە لە شێوەکانی دۆزەخ، هەروەها ڕۆژانە بینینی برا نەخۆشەکەم بەس بوو بۆ ڕوح دەرچوون و تێکشکاندنی مێیینەیی و هەستەکانم، بۆیە هەر کە بردمیان بۆ "شەماعیە" هەستم بەجیاوازییەکی زۆر نەکرد لە نێوان مردن لێرە و نەمان لەوێدا.

ئەرێ بەخوا، هەربستێک و ڕێم بکردایا ژیانم بەسەربڕاوی دەبینی، تەنانەت پتر لە جارێک هەوڵم دا خۆم بکوژم، کەچی لە دوا ساتدا ترس ڕێی لێ دەگرتم، نەمتوانی خۆم لەگەڵ ژیاندا یەکلا بکەمەوە، هەردەم تروسکەی هیوا لە ئازادی و ڕزگاربووندا بەدی دەکرێت، لە ئاوێنە تەماشای خۆم دەکرد و دووبارەم دەکردەوە:

- سبەینێ ڕەنگە باشتر بێت.

هەزار (سبەی) تێپەڕی و تەواو بوو، کەچی شێتیی جیهان، کە دەوری دابووم نەگۆڕا، هەزاری تریش تێ دەپەڕێ و منیش لەم خەرەندە قووڵ و بێ بنەدام، جگە لە فرمێسک ڕشتن، کەس بەهانامەوە نەهات و هیچ شتێکیش بەزەیی پێمدا نەهاتەوە، تەنیا ئەو بووبووە ئەڵقەی دەربازبوونم لەو سەرشۆڕییەی خانەکانی جەستەی دەمژیم.

***

نازانم خێزانەکەم چی بەسەردا هات، دە ساڵ تێپەڕی بێ ئەوەی کەسێک بەلامدا بێت، یا سۆراخێکم بکات داخۆ چی بەسەر ئەو کچەتیوەدا هات، کە وەک سەگی گەڕ سیکتریان کرد، بێ ئەوەی تاوانێکی کردبێ، جگە لەوەی حەزی لە کوڕە دراوسێکەیان بوو، مۆمێکی کوژاوەیە و تەنانەت بەرازەکانیش ئاوڕی لێ نادەنەوە، لە هۆبەکانی شەماعیە شتێلێکم بینی مووچڕک بەویژدان و دەروونیدا دێنن، لاقەکردنی شەوانە، کۆرپەیێلێک لە دایک دەبن و دەمودەست لەناودەبرێن، پیاوانێک دژ بەڕێژیم بوون، بوونەتە لەیستۆک و تاقمێک لە نامەردان گەمەیان پێ دەکەن و پاڵەوانێتی لەسەر جەستەیێلی بەگوریس شەتەکدراوی بێ دەسەلاّت دەفرۆشنەوە، کەچی کەڵبەی کەمتیارەکان بێ بەزەییانە گازی لێ دەگرن، ئەوانەشی خودان پێشینەی خراپ بوون، چێژ لەو لێدانە وەردەگرن، کە ئارەزووی نەخۆشیان دەجووڵێنێت.

لە نێو ئەوانەی بەچاوی خۆم دیتم "ئەمین هاشم بەیتار" بوو، ئەو پیاوەی ناویم بیستبوو و جارێکیان لە شاشەی تەلەفزیۆنەوە بینیم گازی هاوڕێکانی دەکرد خۆیان بدەنە دەستەوە، بێ ئەوەی ناکۆکییان لەگەڵ دەسەلاّتدا هەبێت، کە ئەو بە"نیشتمانی"ی ناو دەبرد، باوکم لە قاقای پێکەنینی دا و لە هەمان کاتدا خەریکبوو بگرییێت بەدەست گەورەیی ئەو ڕابەرە ئازایەی لە ژێر زەبری قامچی و کارەبادا، ناچاری وەڕین و زەڕینیان کرد، چەند جار زۆریان لێ کردم دەرزیی لێ بدەم، تاکو سیس ببێتەوە و وەکو پەڕۆ کۆنەیەکی تەڕی لێ بێت، پەتپەتۆکێی پێ بکەن و بەسەر ئێسکەکانیدا ئەمسەر و ئەوسەر بکەن.

تووشی ڕق لێبوونەوە لە باوکە زەندەقچووەکەم هاتم، هەروەها لە براکەم، کە هەموو شتێکی لەسەر تەڵەی داوونەریت فرۆشت، کە لە شەو و ڕۆژێکدا من بوومە قوربانی، فرێیان دامە بەر کۆمەڵە جەستەیەکی مرۆیی، کە تێر نابن لە هاویشتنی ئاوەکەیان بۆ ناو گیانم، میزاوێک شەو و ڕۆژ چۆڕەی دەهات، کەچی پزیشکی نیشتەجێش بەبێدەنگی خۆی دەپارێزێت، بەڵکو چییان بوێت لە ئافرەت و خواردنەوە و گوریس و ئەو دەرمانانەی نەک هەر برین تیمار ناکەن، بەڵکو وا گڕی تێ بەردەدەن مرۆڤ ئاوات دەخوازێت بمرێت، لە هەمان ژووردا سوارم بوون، کە شەوی تێدا ڕۆژ دەکەنەوە و بەجەستەی ئەمین هاشم بەیتار دەخەننەوە، کەنگێ حەزیان بەبیستنی زەڕین بێت دەیزەڕێنن، بەزەییم پێدا دەهاتەوە و خوازیاری مردنی بووم، ویستم ئەگەر بەکارەکەمیان نەزانیبا بەئەمپوولێک بیکوژم، تا کۆتایی بەو ئێش و ئازارەی بهێنێت.

کابرایەکی خێلۆکە لە بامیە دەچوو، هاتە ژوورێ و لەو وەتاغەی دەرکردم، نەمدەزانی خەریکی چی بوون، لێ گوێم لە ئەمین هاشم بەیتار بوو دەزەڕی.

## ئەمین هاشم بەیتار

پیرەژنەکە گوتی:

– دیارە حــەزت لە تێگووشــەی پاقلە بەهێلکەیە بەپیــازەوە، تۆ ســـبــەی (داوەتیت).

لەو دەمی هاتبوومەوە سەرخۆ گوتم:

– من داوای لێبـووردن دەکەم لەو قسـە بێ مـانایانەی کردمن، من توانام بەسـەر خۆمدا ناشکێت و ئاگام لە خۆم نییە، ئەوان مێشکیـان بەتێهەڵدان و زەڕین و کارەبا شوشـتووەتەوە، گشت شتێکی جەستەمیان ناوەتە ژێر پێوە، هەڵیان وەشاندوومەتەوە.

بەدەم سەر ڕاوەشاندنەوە گوتی:

– دەزانم، دەزانم، خـۆت بەو قسـانەوە مـاندوو مـەکـە دەیانزانم، لێ دەبێ بگەڕێیتەوە دۆخی جارانت، ئیتر خوا حەزکات لەناوچوون.

ئاه ، دەڵێی لەبەر ڕێژنەی باراندام، جەستە و ئاوەز و یادەوەریم لە ژێریدا دەشـۆمـەوە، لەناوچوون، ئـەمـەیە دەمـەوێت هەمـوو سـاتێک بیبـیسـتم، ئاواتم ئەوەیە خەڵکەکە لە شەقام و کڵێسا و قوتابخانە و کۆڵان و مـاڵ و مزگەوتەکان و هەر بستێکی ئەم بەغدایە و دەوروبەریدا پڕ بەگەرووبان بشیرێنن:

ئیتر لەناوچوون.

پێویستە بیر لە خۆمیش بکەمەوە، ئیتر وەرزی بەدڕەفتاری و سووکایەتی پێکردن نەما ، لەمرۆ بەدواوە لە توانای مردوودا نییە لەسەر ژیان ململانێمان لەگـەڵدا بکات، جگە لە ناتەواوی و گـوناه و سـەرکـوت هیـچی دیمان نەبوو، کۆماری هەڵە و کوشتارەکان، قەدەغە بوو تێیدا کەمێک زیاترت لە ئاو و هەوا

ببردایا، گـڵاوکەری هەمـوو شـتێک، تەنانەت ئەو خـواردنەی بەپەلە قـووتمان دەدا، نەکو بێن لە دەرگە بدەن و بەبرسێتی بچین بـۆ ژێرزەمینەکانی کوشتن، ئەو لێبووکەی خەڵکی دەهێنایە پێکەنین، دەتبینی وەکو گوێدرێژی برسی لۆژی دادابوو، مۆخـی مووڕەگە لەسـەر ئـاگرێکی هێـمن دەبرژێنرا، ئافرەتانیش لە مـاڵەکـانیـان دەرنەدەچـوون، نەکـو هەزار (تەڵە)یان لە ڕێگەویان و زانـکۆ و بازاڕەکانـدا بۆ نرابێتـەوە، شـار بەترس و سـام ئابڵـووقـە دراوە، تەلەکـانی لە خـۆی درێژترن، ئاپۆرەیەک لە کەمتیـار و ڕاپۆرتنووس و شـاعیری بەکرێگیـراو بەدەوری بارِ و ماڵ و چایـخانەکاندا دەخـولێنەوە و بۆن بەگووکـەر و ڕۆژنامـەوە دەکەن و بەدوای ئەو قسـەخۆشانەوەن، کە بەمـەبەستی گاڵتە پێکردنیـان نوکتە دادەهێنن.

لەهیکرِا مرۆڤ نقوم دەبێت

گوڵەگەنمەکان ناناسێتەوە

گیتارەکەش لە ژەنین کەوت(*)

ئاوەزم هەردەم لـە بێـداربوونەوەدایە و پێـشـتـر بەم ئاوایە بـەردەوام نەبووە، من ئـەمین هـاشم بـەیتـارم، دەبێت نـاوم دووبارە بکـەمـەوە، تـاکـو بڕوا بەخـۆم بهـێنم وێڕای ئەو هـەمـوو شـتـانەی پـێـیـان کـردووم، هـەر زینـدووم، بۆ بازاڕی سەفافیر و سەرای و شەقامی موتەنەبی چووم، لەسـەرخۆ ڕێم دەکرد، جلەکانم پاک و پوختە و ڕێکن، منداڵ بەدوومدا ڕاناکەن و کەسیش نییە پێم بڵێت:

- هۆپ هۆپ، تاسەیەک لە بەردەمتدایە.

ئەوەندە خـواردنم هـەیە بەشـی ئێـواریَ و قـاوەڵتـیم بکـات، سبـەینێش لەگـەڵ پیرەژندا دەچمـە کۆشـکی مـیـوانداری، بەنانەوڵای پاقلە و هـێلکە و پیـاز تـاجی پاشایەتی لەسـەر دەنێم و بەتامترین خـواردن لە منداڵییەوە ناسـیبێتم دەخۆم، وەلێ ناچـاری نووسـتـنم لە ژێر هـەر پردێـک لە پردەکـانـی بەغـدادا بێـت، تاکـو ئاگام لە ئاوەزم بێت، کە جارناجارێک ڕیسوام دەکات.

---

(*) شیعری پاپلۆ نیرۆدایە. (نووسەر)

خەڵکەکە سەریان لێ شێوا بوو دەهاتن و دەچوون، نەیاندەزانی جگە لە سووتاندنی باڵەخانە و شانۆ و دەزگا حکوومییە گەورەکان زیاتر چی بکەن، وێنەکانیان دەدڕاند و سواری پشتی پەیکەرەکان دەبوون و پێڵاوە درزبردووەکانیان دەکێشا بەسەریاندا و هێندیان کێشابوو بەقوونی دیکتاتۆردا، کە دوای کاژێرێک لە بەترسەوە دەرچوونەکەی لە تەلەفزیۆن و هارەی چەپڵەی دروستکراو ون بوو، ئەو شانوشکۆیەی بەدرێژاییی سی و پێنج ساڵ ڕای بوارد چی لێ هات؟ چۆن بەم خێراییە ترسی خەڵکەکە ڕەوییەوە؟ هەزاران دوای ئەم هەموو ساڵە پڕ لە قاتوقڕییە چ مێژوویەکی سەیر دەنووسنەوە؟

گشت دنیا لە گۆڕەپانی فیردەوسدا سەما دەکات، عاباکان هەڵدەپەڕین، پیاوان لە دۆخی هێستریا و خۆشیدا بوون، منداڵان بەملاو بەولادا غاریان دەدا، نەمدەزانی چییان لە مێشکدا بوو، درۆم نەکردبێت لەودەمی خەڵکەکە هەڵدەپەڕین و سەمایان دەکرد ئافرەتێکم بینی دەمناسی، بەبەرچاومەوە لە ژووری وەڕین و زەڕین، بەدەم خواردنەوەوە پەلامارى ئەو ئافرەتەیان دا، سەری خۆم توند گووشی، لەودەمی من لە نێوان کۆتەڵەکەی دەکەوتە ژێر پێی جەماوەرەکەوە و شەپۆلی تووڕەیی و سەدان پێڵاودا بووم، کە بۆ لێدانی ئامادە بوون، خەریک بوو ئاوەزم شکستم پێ بهێنێت.

ئەوی ڕووی دا ناگێڕدرێتەوە، دەبێت لەگەڵیدا بژیت، تەنیا ئازایەتی بەس نییە، ئازایەتی پێویستی بەشێتیی زیاترە، لوولپێچ دەکارێت خۆی بشارێتەوە، هەروەها ژیژکیش دەتوانێت ئەمە بکات، مرۆڤ لاوازترین ئافەریدەی خوان نەک مار و مێروو، هەر شەڕێک لە دنیادا هەڵگیرسێت دەبێت ڕۆژێک دوایی بێت، تەنیا شەڕی ئێمە نەبێت، کە بەدەر لە وێناکردنی ئێمە درێژەی کێشا، زیاد لە نیوەی تەمەنمانی لەگەڵ خۆیدا برد، دۆست و ئاوەز و چۆلەکە و باڵندە ئاوییە بچکۆلەکانی لەدەست کردینەوە، هەروەها ڕووباری دیجلە و شینەشاهۆ و بۆن و نێرگز و بێتاوانیی ڕامالی، وابزانم هەموو شتەکانی لەگەڵ خۆیدا برد

و له دوای خۆیەوە تەنیا کەمئەندام و ئاگری دارستانەکان و فرمێسکی بۆ جێ هێشتین.

ئەمین هاشم بەیتار بەدرێژاییی سێزدە ساڵ، بووە مەیموونێکی تەواو، نەیتوانی لە دەستیان قوتار بێت، کەچی ژیژک و لوولپێچ دەتوانن لە دەروازەکانی گەمەکە ئاودیو بن، تەماتە لە هاوین و زستاندا بەسوودە، عارەقی زەحلاویش لەمەیی هبهب نایابتر و بەتامترە لە سێو و هەرچی پاقلەوەی دنیا هەیە پێی ناگات، هەزار درهەم بۆ جگەرەیەک دووکەڵەکەی خۆشترە لە پەڵە هەورە کۆچەرییەکانی بەرەو ڕۆژئاوا دەکشێن، ژیان لە ڕۆژگاری نووری سەعید پاشادا وا نەبوو، تەنانەت ژمارەی زیندانەکانیش بۆ پیاوانی سیاسەت لە چلی تێپەڕ نەدەکرد و سەدیش بۆ دز و جەردە و شێتەکان، بەر لەوەی بەندیخانەکان نیوەی گەل لەودیو دیوارەکانیانەوە بگرنە خۆیان و نیوەکەی تریش لە پشتەوە گیرابن.

گرینگ ئەوەیە ئێستا پیرەژن تێگوشیی پاقلە بەهێلکەم لەگەڵ پیوازدا بۆ دێنێت، خواردن لەسەر شۆستە بەتامترە، ئەی چی دەڵێی ئەگەر چایەکیشت بۆ بێنێ و بیخاتە ناو لەپتەوە؟ نیوەی تەمەنم بەبا ڕۆیشت، نیوەکەی تریشی لەوێ پارچە پارچە بووە، نازانم ئەوی لێم ون بووە لەگەڵ ئەوی پارچە پارچە بووە چۆنیان کۆ بکەمەوە، پیرەژن پێی گوتم ئێمە یەکجار دەژین، یەکێکمان وەک بەرخ دەژی و ئەوی تریش وەکو سوارچاک بەسەریدا تێ دەپەڕێت، پێم گوت:

– ئەسپ و شیرەکەیان لێ سەندم، ئیتر چۆن ببمە سوارچاک؟

لەودەمی لەبەر ئاگرەکەدا هەڵدەلەرزی، گوتی:

– ئەسپەکەتیان نەبرد، شیرەکەشت هەر پێیە، ئەوانن شمشێر و ئەسپیان لەدەست دا، تەماشای خەڵکەکە بکە، لە خۆشییاندا گەنجینە و ماڵی خۆیان سووتاند.

ئامازەی بۆ دووکەڵی ئاگرێک کرد، بڵێسەی هەموو شوێنێکی گرتبووەوە،

ئەو قسەیەم بیرکەوتەوە، کە دەڵێت: تاقە ڕۆژێک بەشێری بژی، لەوە باشترە سەد ساڵ مەڕئاسا بژیت.

منیان ناچار کرد ببمە (کەریان)، کە بەهەموو دەنگییەوە دەیزەڕاند، تاکو پێی پێکەنن و ئەگەر درێژەی داییێ بدەنە ناوگەڵیدا.

دەستی لەرزیوی پیرەژنم گرت و ماچم کرد، هەرچەندە ئەو ڕای کێشا و گوتی (ئەستەغفیروڵڵا)، کەچی من بەتوندی گرتم و گوتم:

- شوورەیی نییە بۆ کوڕ پێڵاوی دایکێکی خۆت ئاسا ڕامووسێت.

## ئەسعەد سەعید فەرحان

نەفرەتی خوا لەو کەسەی ئەم ناوەی لێ نام، تەنانەت ئەگەر باوکیشم بێت، چونکە جگە لە شوومی و بەدبەختی هیچی بۆ نەهێناوم، ئەسعەد؟ و سەعید؟ هەروەها فەرحانیش؟[١] ئەوەتا من نۆ ساڵە دەڵێی فەردە گەنمم، لە گرتووخانەوە بۆ ژووری تاکەکەسیی ژێرزەوی، لەوێشەوە بۆ نەخۆشخانەی شەماعیەم دەگوازنەوە، بۆ شوێنێک نازانم لە نەخشەی ژێرزەمینی بەغدادا کەوتووەتە کوێوە، لە شەقی پۆستاڵ و (قەحپە دایک) و لەو دارەی ئاگر لە پشت و سەر و بەتایبەتیش لە قوونم بەردەدات تێر بووم.. چەندێک بەو دارە دارکارییان کردم، هەینێ بۆ سەر پێشاو دەچووم، خێراکە هەی کچی هێن، وەرە هەی بەنازی سووک و چرووک، پاشان بۆ ریسواکردنم لەم دۆخەی پێی گەیشتووم ناوم وەک خۆی دەبەن، من ئەسعەد سەعید فەرحانم، کە ئارەقی شەرمەزارییان پێ ڕشتم و هەر لە یەکەمین شەودا کەوتمە بەردەستیان، بەدەیان جاریان لاقە کردم، جەستەم نەرم و شلە، لەشێکی وەک بەفر سپیی ژنانە، ئەوانیش ئازادن لەوەی حەز لە چی دەکەن و خەون بەچییەوە دەبینن و چی دەکەن، کەس ناتوانێت نارازی بێت، کەسیش ناکارێت خۆی بکوژێت، تەنانەت مردنیش لەم خەرمندە تاریکەدا قەدەغەیە، هیچ تاوانێکم نییە ئەوەندە نەبێت من خزمی ئەمین هاشم بەیتاری ئەمینداری حزبی شیوعیم، کە بەر لە چوار ساڵ گرتیان، ئیتر لەو ڕۆژەوە نەمانزانی چی بەسەرهات، ئەو بەیانییەی دەستگیریان کرد (وەکو دەڵێن) خەریک بوو بۆ چاوبەستی بەدیشداشە و پاسپۆرتی ساختەوە هەڵبێت و بەغدا جێ هێڵێت، پاشان ناچاری دانپێدانانێکی مەترسیدارییان کرد:

---

(١) ئەسعەد: بەختەوەرترین. سەعید: بەختەوەر. فەرحان: دڵخۆش. (و)

حزبی شیوعی بووه رابردوو، لەسەر هاوڕێیانە خۆیان بدەنە دەستەوە بەمسۆگەرکردنی بەردانیان، دوای ئەوەی ئەو زانیارییانەیان لێ وەردەگیرێت، کە سوودیان بۆ بەدیهاتنی یەکیەتییەکی نیشتمانیی وا، نەتەوە و ئاینزا و (ئەو سەرێشانەی) تێدا بەش بەش نابن.

لەوێ لە شەماعیە بینیم (خۆزگە نەمدیتبا) بەهەموو توانی دەزەڕی، تاکو کەوڵی نەکەن، کابرا کورتەبنە قەڵەوەکە لێی پرسیم:

– تەماشا بکە و چێژی لێ ببینە، ئەمە ئەو ڕابەرە زیرەکەیە لە دوایەوە ڕۆیشتن، باش سەیری بکە، داخۆ کەرێکی لەمە باشترت دیتووە؟

جلەکانیان لەبەر داکەندم و بەبەرچاوی ئەمین هاشم بەیتارەوە سوارم بوون.. قەڵەوە کورتەبنەکە بەوەی کردیان وازی لێ نەهێنام، بەڵکو لەسەر شتێکی نووک تیژ لە داری دەکرد، دای نیشاندم و بەدەم پێکەنینەوە بەئەنگوستی ئاماژەی بۆ دواوەم دەکرد:

– وابزانم ئەمە لەوە درێژترە، کە تۆ حەزت پێیەتی.

ئەوە یەکەمین و دوامین جار بوو ئەمین هاشم بەیتاری مامۆستامی تێدا ببینم وەک گوێدرێژ بزەڕێت، دواتر گواستمیانەوە بۆ ئەم ژێرزەوییە تاریک و نووتەکە، گشت جارێک لە سەرکەوتن و دابەزینمدا بەپلیکانەکاندا یەک یەک دەیانژمێرم، هەموو جارێکیش لە دابەزین و سەرکەوتندا بەدرێژایی پلیکانەکان سی و چوار دار بەر شان و قنگم دەکەوێت، بێ ئەوەی ئەوی دارکاریم دەکات جارێک لە بیری بچێتەوە، هەر جارێک پەلکێشی ژووری لێکۆڵینەوەم بکەن، ئەو ژوورەی بەهیچ کلۆجێک زارمی تێدا هەڵناهێنم، تەنیا ئەوەندە نەبێت دەڵێم (بەخوای گەورە بێتاوانم..) و هەر جارێکیش ئەوە دەڵێم لەمە زیاترم بەرگوێ ناکەوێت:

– ئەگەر خوا لەم شوێنەی تۆدا با، ئەوا چارەنووسی زۆر لەوە خراپتر دەبوو، کە پێتی دەکەین، هەی مریشک.

بەشەو وەکو ڕۆژ لە جەستەم تێر بوون، کەسیان وازی لێ نەدەهێنام، من

جگه له کەنیزەکێکی شۆخ و شەنگی ڕۆژگاری هاڕوونە ڕەشید زیاتر، کە جەستەیەکی پڕی هەبێت و ئەوان حەزیان پێی بێت هیچی تر نەبووم، ئەوەتا ئەمڕۆش گوێم لە دەنگێک نییە و نازانم چی ڕووی داوە، کاژێرەکان ڕادەبوورن و کەس نایەت، گوێم لەو دراوسێیەم بوو، کە ژوورەکەی بەقەد ژوورەکەمەوەیە، دەڵێت:

– لەوە دەکات لە برساندا بمرین.

ئەوە یەکەمین جار بوو لەو ژێرزەمینە ئەنگوستەچاوەی تێیداین دەنگی مرۆڤ ببیستم، کەچی گوێم لە دەنگێکی تریش بوو دووبارە دەیگوت:

– لەوێ شتێک ڕوو دەدات، بڕوام پێ بکەن کوڕینە، لەم کاتەدا شتێک ڕوو دەدات.

وابزانم کەوتە بەرگوێم لە ئاسمانەوە دەنگێک دێت لە هەورەتریشقە دەکات، هەرچەندە ئێمە لە شوێنێکداین گوێمان لە هیچ نابێت، تەنانەت ئەگەر تەقینەوەی بۆمبیش بێت، یاخۆ بانگی مزگەوتەکان، خەریکە دەسەڵاتی ترس و سام وامان لێ دەکات بیرمان بچێتەوە بەغدا چۆن بوو، نە هەراوزەنای بازاڕی شۆڕیجە و نە هاڕەی ئۆتۆمۆبێل لە شەقامی ڕەشید، نەیش ئەو ژاوەژاوەی بازاڕی سەفافیر، یاخۆ عەشقبازیی کوڕان لە شەقامی نەهردا، ئێمە لە بەشێک یاخۆ لە پەنایەکین تەنانەت شەیتانیش پێی نازانێت، سی و چوار هەنگاو لە ژێر ڕووی زەوییەوە بەدەرگەی ئەستووری پۆلایین داخراوە، تەنانەت مار و مێرووش ڕێگەیان ناگاتە لای ئێمە.. ئێ ئەو مار و مێروانە چۆن بێنە ژوورەوە ئەگەر پاسەوانانی شەیتان لە بۆسەدابن بۆ هەر هەناسەدانێک، جگە لە هەناسەی بەئاستەمی ئێمە، کە لەوەیان دڵنیا دەکاتەوە لە باوەشی چ ترس و ئیفلیجبوونێکداین.

دراوسێکەم بەدەنگێکی بڵندتر لەو دەنگە تۆقیوەی بەر لە خولەکێک دەری بڕی، گوتی:

– ئێمە پێویستمان بەپەرجوویەکە، تۆ بڵێی ئەو پەرجووە هاتبێتە کایەوە؟

دووەمیش بەدەم کوتانی دەرگەی ژوورەکەیەوە گوتی:

- ئەگەر ببیستن ئێمە دەڵێین برسیین و گوێمان لە دەنگی پێڵاوەکانیان نەبێت بۆ لامان بێن، مانای شتێک دەدات.

بەتوندی بەدەرگەکەیدا دەکێشا، پاشان پەنگری ئازایەتی گرتینییەوە و بەگشت هێزمانەوە بەدەرگەکانماندا دەکێشان، کەچی تاقە وەلامیان بێدەنگی بوو بۆمان، شەوێکی جەرگبڕ و بەسام تێپەڕی، تێیدا دڵنیا بووین دنیای دەرەوەی ئەم ژێرزەمینە تووشی ناتەواوییەک هاتووە، یاخۆ مژدەیەکی گەورەی پێیە،.گوێم لە دراوسێکەم بوو دەیگوت:

- کوڕینە، دەبێت بیر لە چارەسەرێکی بەپەلە بکەینەوە، ئێمە کەوتووینەتە داوەوە، خەڵک بەم شوێنە نازانن و کەسیش نییە فریامان بکەوێت، ئەگەر خۆمان فریای خۆمان نەکەوین.

یەکێک تا ئەو ساتە دەنگیمان نەبیستبوو، گوتی:

- دەرگەی من کراوەیە، ئەوە بیست ساڵە لەسەر پشتە، بەڵام من ئیفلیجم و هیچم پێ ناکرێت.

یەکێکمان هاواری بەسەردا کرد:

- دەبێت خۆت بەزەوییەکەدا بخشێنیت برا، هەوڵدە زگەخشکێ بکە، بەڵکو کلیلەکان بدۆزیتەوە هێشتا بەقفڵی دەرگەکانمانەوەن، لە پێناوی ئێمەدا زگەخشکێ بکە بۆ خاتری خوا.

دوای بێدەنگییەک لەو بێدەنگییە ناچوو ئێمە تێیدا بووین، کابرای لە پێ کەوتوو دەیکێشا بەدیواری ژوورەکەیدا و دەیشیراند:

- بەڵێ، هەر دەرگەیەک لە دەرگەکانتان کلیلی پێومیە.

وابزانم لەو دەمی دووپاتی دەکردەوە دەگریا:

- هەر دەرگەیەک لە دەرگەکانتان کلیلی پێومیە..

بەدەنگێکەوە بڕوا ناکەم دەنگی من بووبێت، پێم گوت:

- هەوڵدە دەرگەیەک لە دەرگەکان بکەیتەوە، ئیتر ئەوانی تر لەسەر ئێمە.

گوێمان لێبوو چۆن جەستە ئیفلیجبووەکە بەسەر زەوییەکەدا دەکشێت، گوێمان لە هەناسەبرکێی بوو و خۆمانیش ددانەکانمان جیڕ دەکردنەوە، نەماندەزانی مەودای نێوان دەرگە و دەرگەیەک چەندە، لێ هەموومان لە دۆخی بێدەنگی و گرژبوونەوەدا بووین، هێندەی نەمابوو برادەرەکەمان لەودیو دیوارەکانەوە ببینین زگەخشکێ دەکات، لەهیکرا هەستم بەترسێک کرد لە چەشنی جلی سووتاو دای پۆشیم، چی دەبێت ئەگەر ئەمە گەمەیەک بێت (لەوانەوە)، تاکو پێمان ڕابوێرن، پاشان جەستەمان بخەنە بەر ئامێری ئەشکەنجەدان؟ وەلێ دەرگەکەی من، جیا لە دەرگەی ئەوانی تر، کرایەوە و ئەو تارماییەم بینی، کە لە مرۆڤی نەدەکرد، مەبەستم ئەو بوونەوەرە لە پاوپل کەوتووەیە دەرگەکەی لێ کردمەوە، موو لە چەشنی عەبا سەری داپۆشیبوو، تا ڕادەیەک جگە لە چرەموویەک دەرگەی لێ کردمەوە کەسم نەبینی، بێ ئاگا لە خۆم بازم دایە دەرەوەی ژوورەکەم و چووم دەرگەکانی تر بکەمەوە، بەشتێک دەمکردنەوە ڕۆژێک لە ڕۆژان پەنجەم بوون، دەرگەم لە هەر یەکێک دەکردەوە جگە لە عەبایەکی ڕەش سەری داپۆشیبوو هیچی ترم نەدەبینی، بۆم دەرکەوت ئێمە پێنج کەس بووین شەشەممان ئەو پیاوە ئیفلیجە بوو، کە وتی:

- با تەنیا یەکێکمان بڕوات بزانێت چی ڕووی داوە، ئەوانی تر با لە شوێن خۆیان بمێنن، دەبێ یەکێکمان دەست لە خۆی بشواتەوە، ئەگەر خۆم بمتوانیایا بەپەیژەکاندا سەرکەوم ڕووم لە ئێوە نەدەنا.

بێ ئەوەی گوێ بەوە بدەم دەیڵێن، خۆم بینی (هەڵبەت من بەتەمەن بچووکترینیان بووم) بەپەیژەکاندا لۆقە دەکەم، بێ ئەوەی کەس بەلاقنگمدا بکێشێت.. ئا لەوێ بینیم.

***

دیتم ئەو شوێنەی ئێمەی لێین خاڵییە لە مرۆڤ، کەس لەو ژوورانەدا نییە، کە تێیاندا لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا دەکردین، جێگەکەش جگە لە ماڵێکی چێنراو لە نێو ماڵەکاندا چی تر نییە، ئێمە هیچمان نەدەزانی، کیسەیەکی ڕەشیان بۆ

هێناین و دایانە بان سەری هەر یەکێکماندا، تەنانەت لە کاتی بردن و هاوردنماندا لە ڕەشایی زیاتر هیچمان نەدەبینی، نەماندەزانی کێ بردمانی بۆ سەر دەستشۆر، یاخۆ بەرەو تێهەڵدان و سووکایەتی بەکێشمان دەکات، سەرنجێکی ژووری لێکۆڵینەوەم دا، هیچ شوێنەوارێکی ترس و بیم لەوی هەستمان پێ دەکرد، تێدا نەبینی، تەنیا ژوورێکی بۆش و بەتاڵە و دیوارەکانی لەگەڵ دیواری هەر ژوورێکی تردا جیاوازییان نییە، کەواتە ئەو ترس و تۆقینە لە کوێوە چوونە گیانمانەوە؟ بێگومان ئەو ترسە لەوەوە سەرچاوەی گرتووە نەماندەزانی لەگەڵ کێدا قسان دەکەین.

بەپەلە چووم بۆ لای گیراوەکانی تر، لەوددەمی هەناسەبڕکێیەکی تێکەڵ بەخۆشی و گومان و دوودڵی دای گرتبووم، پێم گوتن:

– نازانم چی ڕووی داوە، گوێم لە دەنگی تەقینەوەی زۆر نزیک بوو، شتێکی مەزن لە بەغدادا ڕوو دەدات، ئەم شوێنەی ئێمەی تێداین تەنیا ماڵێکی بچووکە لە نێو ماڵەکانی تردا، کێ بڕوا بەمە دەکات؟

ئیفلیجەکە گوتی:

– من لە ساڵی ١٩٨٥ـەوە ئەمە دەزانم، یەکەمین کەسیشم قاچیان شکاندم نەکو هەڵبێم، دەبێت ئێوە بۆنی ئەو شوێنەتان کردبێت، کە منی تێدام.

بۆنی میز و گوو ژێرزەمینەکەی پڕ کردبوو، لێ ترسی ئەو کاتەمان هەست بەبۆنی بۆگەنیی لامان ڕەواندبووەوە، ئەو بۆگەنییەمان جێ هێشت و کابرای ئیفلیجمان بەچواردەستە بەگوو و جلە پۆخڵەکانییەوە هەڵگرت، کابرا گوتی:

– لێرەدا جێم هێڵن، دوایی وەرنەوە، گرینگ ئەوەیە بزانین چی بەسەر دنیادا هاتووە؟

ناگەهان، بەدەیان زەلام هاتنە خوارەوە، یەکیان لەوددەمی تەماشای سیما و ڕووی سەیرمانی دەکرد، لێی پرسین:

– ئێوە لەکەیەوە لێرەن؟

وەڵامی جیاجیای درایەوە:

- بیست ساڵە.

- من لێرەم لە... نازانم، لێ ساڵانێکی زۆرن، ئێمە ئێستا لە ساڵی چەنددابن؟

- ساڵی ١٩٨١ ڕفاندمیان، دوای ئەوەی ڕەتم کردەوە بۆردومانی قوتابخانە و نەخۆشخانەکانی تاران بکەم، من مەحموود کوردیی پێشەنگم.

من تاقە کەس بووم گوتم:

- لەوە دەکات من دوا کەس بم بۆ ئێرەیان هێنابێت.

هەندێک لە زەلامەکان کەوتنە شکاندنی میناکان، دابەزینە ئەو ژێرزەمینەی ئێمەی تێدا بووین، گوێمان لە زرمەی فڕۆکەکان بوو بۆردومانیان دەکرد، دەمانپرسی:

- چی ڕووی داوە؟

چەند زەلامێکی تریش هاتنە خوارێ، بەبەزەیی پێداهاتنەوە و بەسەرسوڕمانەوە چاویان تێ بڕیبووین، یەکیان لەو کاتی بەواقوڕماوییەوە سەرنجی شوێنەکەی دەدا، گوتی:

- سەیرتان نەیەت ئەگەر بڵێمماڵەکەم بەتەنیشت ئەم دۆزەخەوەیە، کە ئێوەی تێدان، بەو خوایە دەمزانی ئەم شوێنە نهێنیی گلاوی شاردووەتەوە.

لێم پرسی:

- ئێمە ئێستا لە چ گەڕەکێکی بەغدادابن؟

بێ ئەوەی سەیری بەپرسیارەکەمدا بێتەوە، وەڵامی داوە:

- ئێمە لە ناوچەرگەی "بەتاوین" داین، لێرە لە دووری چەند مەترێکەوە منداڵان شەو و ڕۆژ یارییان دەکرد، هیچ گوێتان لێ نابوو؟

یەکیان لە کاتی دەرچوونیدا لەو ژێرزەمینەی ئێمەی لێ بووین، گوتی:

- چۆن دەبیستن، بەخۆت وەرە و سەیری ئەم زەلکاوە بکە، کە تێیدا بوونە، ئەمە چیرۆکێکە ناچێتە مێشکی کەسەوە.

کابرای ئیفلیج گوتی:

- کوڕینە گرینگ ئەوەیە پێمان بڵێن چی ڕووی داوە، خوا دەست بەباڵتانەوە بگرێت.

ئا لەو دەمەدا گوێمان لەوە بوو، کە دەبوو بەر لە ملیۆنان ماڵوێرانی و حەسرەت و زەبوونی بیبیسین:

- هەموو شتێک تەواو بوو، ڕێژیم ڕووخا، گەورەکەیان هەڵات و کەسیان نەمان، خێراکەن بۆ بینینی دیواربەند و پەیکەرەکان چۆن دەکەونە بەر پێڵاوی جەماوەر.

سەیرترین شت لەو چرکەساتەی ڕۆژگاری خۆشی ڕووی دا، بەڵکو سەمەرەترین شتێک لەگەڵیدا ژیابم و لە گشت ژیانمدا نەمدیبێت، ئەوەبوو کابرای ئیفلیج گوتی (سوپاس بۆ خوا) و مرد، وا دیارە بیست ساڵە چاوەڕوانی ئەم ساتە بوو، بڕیاری دا وێڕای ئێش و ئازار و ئیفلیجییەکەی بژێت، تاکو ساتی ڕووخانیان ببینێت، ئەگینا لە داخاندا دڵی دەتەقی، خۆ ئەگەر ئەوی دەیخواست هاتە دی، ئەوا هیچ شتێک لە کۆچی بەختەوەر و مەرگی بێ پەشیمانی خۆشتر نییە.

ڕژاینە سەر شەقامەکان، ئەو ساڵانەی لەوێ خۆڕا بەباچوون پێشمان کەوتن، لە نێو حەشاماتەکەدا بیرمان هاتەوە، هەر یەکێک لە ئێمە ڕیشێکی هەیە مایەی سەرسوڕمانە، سەرەڕای ئەوەش بەشادی و تامەزرۆییەوە هاوارمان دەکرد، هەینێ پەیکەرێکی دیمان دەبینی دەکەوتە ژێر پێڵاوەکانەوە، لە کوتانی ئەو سەرۆکەی بەرەو شکستی و هەژاری و ماڵوێرانی بردین نەدەوەستاین، مەحموود کوردیی پێشەنگم بینی سەرکەوتووەتە سەر کۆتەڵی دیکتاتۆر تفی لێ دەکات و دەکێشێت بەدواوەیدا و بەسەریدا دەشێرێنێت:

- ئەوە بۆچی وەستاوی و ناجووڵێیت هەی کەری چەمووش؟

بڕوام نەدەهات، ئەمە لە سەرووی خەونەکانمەوەیە، لە بان ئەوەی ئاواتم بۆ دەخواست، بەڵکو لە سەرووی هەر ئەفسانەیەکەوەیە بەمێشکمدا هاتبێت، کە

ببێته چارەنووسی وڵاتێک جوانترین ڕۆڵەکانی بەسێدارە و سووتان و گوللەباران مردن، ئەوی لەوێ لە شەماعیە ڕووی دا بەپەردەی بیرمدا هات، چۆن ئەو دارە ئەستوورەیان تێ بڕیم، تاکو ئەمین هاشم بەیتار، کە لە ژێر چنگیاندا بوو بمبینێت، ئەویش چ بۆ خۆی و چ بۆ منیش دەگریا، ئا لێرەدا هەراسانم لێ هەڵگیرا، شیشێکم بەرچاو کەوت، هەڵم گرت و بەرەو پەیکەرەکەی (سید الرئیس)، کە مەحموود کوردی سوار سەری بووبوو ملمنا، لە ساتی تووڕەبوونێکدا، کە بەدرێژایی ساڵانی گرتنەکەم نەیگرتبووم، شیشەکەم بڕیە قنگی سەرۆک و ئەو شتەم گوت، کە ڕۆژێکیان پێیان گوتم و لە بیرم ناچێتەوە:

- وابزانم ئەمە لەوە درێژترە، کە تۆ حەزت پێیەتی.

نازانم بۆ لە پرمەی گریانم دا، من هەینێ تووڕە دەبم خۆمم بەدڵ نییە، ئەویشی کردم سروشتی من نییە، تەنانەت ئەگەر ئەمەشم لەگەڵ بارستاییەک لە لاستیکی بەتاڵیشدا کردبێت، داخۆ دەبێ چییان لێ کردبم تاکو سروشتی گورگم وەرگرتبێت؟

بێ ئەوەی بزانم (بۆچی).. بەهێمنی و سووکی بەرەو ڕووباری دیجلە ڕۆیشتم، تووڕە و تۆسنییەکەمی هێور کردەوە، لە ڕووبارەکە نزیک بوومەوە، بینیم دەستم خوێنی لێ دێت، ئەم خوێنەی جلەکانی نەهێشتووم لە کوێوە هات؟ وادیارە ئەو کاتی پڕم بەشیشەکەدا کرد و بڕیمە جەستەی پەیکەرەکە خۆم بریندار کردووە، قامکەکانم لە ڕووباری دیجلەدا شوشتن، چەندێک دۆخی ئەم ڕووبارە ئەزەلییە سەراسیمەی کردم، دوای ئەوەی لە ژێر بۆمباباران و ئاگردا وشکی کرد خەریکە ون دەبێت، خۆم دایە بانیا، جەستەی خۆمم بۆ هەڵدا، لە گریان نەدەکەوتم، تاکو سەرلەنوێ پڕم کردەوە و وەکو جاران ڕێی کردەوە.

## ئەمین هاشم بەیتار

خەریکبوو تاڵان و بڕۆ شێوەیەکی هێستیری وەردەگرت، وەزارەت و کۆمپانیا و مۆزەخانە و بەنکەکان قوتار نەبوون لە تاڵان و بڕۆ و سووتاندن، چرەدووکەڵ پایتەختی لە بەری کەرخ و ڕەسافەدا داپۆشیبوو، تەنانەت ڕووباری دیجلەیش گڕی گرت و ئاوی کەم تێدا مایەوە، لە ئەنجامی ئەو ئاگرەی بڵێسەکەی ئەمبەر و ئەوبەری گرتبووەوە و ئەو ڕووبارە مەزنە بوو بەهەڵم و هێندەی نەمابوو بنەکەی ببینین، کە بەدەمیان تەرمی کەلەپچەکراوی تێدا بوو، بەر لە دەمیان ساڵ لە دەروازەکانی کۆشکی سەرۆکایەتییەوە فڕێدرابوونە ئاوەکەوە، ماسیی ڕووبارەکەمان دەبینی لە دۆخی هەلاتنی بەکۆمەڵدا بوون بەرەو باشووڕ، بەڵکو بگەنە قوڕنە و دەریای عەرەب، نەکو ئەوانیش لە گۆڕی بەکۆمەڵدا بمرن، وەک چۆن بەدرێژاییی بیابان لە نەجەف و سەماوە و ناسریە و کەربەلا و عیمارەدا بینیمان، هیچ باڵندەیەک بەئاسمانەوە نییە، هەموویان بەدوای شوێنێکی ئارامدا وێڵن، نەک ئەو دووکەڵەی بەری ئاسمانی گرتووە و ڕووناکییە درەخشاوەکەی لێ سەندووەتەوە، سەرجەم بوونەوەرەکان لە دۆخی کۆچڕەو و ترسدان، بەغدا جێ دەهێڵن و ڕوو لە ئاسمانی شین دەکەن، مەگەر لە خەونەکانماندا ببینین، کەس نەماوە جگە لە شێتەکان نەبێت، هاوەڵەکانم، بێ هەستکردن بەوەی بەسەرماندا هاتووە، بەرەلای سەرشەقام و ڕێگەکان بوونە.

لەوانەی لەگەڵمدا بوون لە شێت و گیراوەکان دەگەڕێم، داخۆ ئێستا حەسوون ئەبول عەسافیر چی دەکات، کە دوای ئەوەی بەدرێژاییی ڕۆژێکی ڕەش کێشایان بەکێر و گونیدا و ئەویش دانی بەو شتانەدا دەنا، کە هەرگیز نەیکردوون، بەتەواوی ئاوەزی لەدەست دا، پاشان ناوی لەبری عەبدولبارییەوە بووە (ئەبول عەسافیر)، وای لێ هات چۆلەکەی دەبینی بەبان سەریەوەن،

ئەویش بەردەوام سەری پاس دەکرد نەکو کونی بکەن، ماوەی ساڵێکی ڕەبەق لە شەماعیە زاری هەڵنەهێنایەوە، جگە لە : کش، کش، کش و ئەو چۆلەکانەی دەردەکرد، کە هەرگیز نەمانبینین..

ئەی داخۆ سەرحان مهاوشی سەرۆک خێڵ چی بەسەرهات؟ کە جلە سپییەکانی و چەفیە و عەگالەکەیان ونجڕ ونجڕ کرد و دوای ئەوە لێگەڕان سمتی لەسەر زۆیا نەوتییەکە ببرژێت و دارزێت، ئینجا بەدەم هۆسەی تیزمجارییەوە بەدەوریدا دەسووڕانەوە و دەیانگوت:

شێخ مهاوش هەی بۆرە

ئەمە قوونە یا گندۆرە

تاوانەکەی شێخ سەرحان مهاوش هیچ نەبوو، تەنیا ئەوەندە نەبێ شەوێکیان لە دیوەخانەکەیدا دوای ئەوەی بیستبووی زمانی لاوێکیان بڕیوە لەسەر ئەوەی گوایا جوێنی بەسەرۆک داوە، گوتبووی (خوا لە شەڕی شەیتان بەدوورمان بخات).. ئیتر قسەکەیان لەبارەی شەڕی شەیتانەوە وا لێکدایەوە ڕێک لەگەڵ حوکمدانەکەیدا بێتەوە، نزیکتر بێت لە تۆمەتی (گوێڕایەڵ نەبوون) بۆ گەورەی گەوران.

ئەی بەر لە حەسوون ئەبول عەسافیر و سەرحان مهاوش، ئەسعەد سەعید فەرحان چی بەسەر هات؟ ئەو تاقە کەس بوو بینیمی بەدەم کەڵبەکانیانەوە دەزەڕێنم، منیش تەنیا کەس بووم بینیم چێژ لە گۆشتە سپییە ناسکەکەی وەردەگرن، دووپشک ئاسا کێبڕکێیان لە شایی پێوەدانیدا دەکرد، کە لە چاخی بەردینیش، لەو ڕۆژگارەی مرۆڤ لە خراپترین دۆخی دڕندەیی و برسییەتیدا بووە، شتی وای بەخۆیەوە نەبینیوە.

ئەی لەم شوێنەی تایبەت بەنەخۆشە چی ڕوو دەدات؟ لەبارچوونی سەرەتایی ئافرەتە شێتەکان، بەرنامەی پێکەنین و ڕابواردنی نیوەشەو، بەدەیان قوربانی، سەرسەری، سووک و چرووک لە هەموو ڕەنگێک، تەنانەت نازانیت دوای چرکەیەک چی دەکەن، گشت شتێک بۆیان ڕەوایە، فیلمی ڕووت

بۆ ڕاهێنان لەسەر دوا داهێنانەکانی سێکس، ئامێری سەردەمی مەغۆلەکان بۆ سەربڕینی هەستەکان و کوشتنی ڕوح لە ڕێی ڕێگەدان بەکردن لە دواوە، ئەم مەیموونانە لە کوێوە هاتوون؟ مرۆڤ چۆن بەم خێراییە دەگاتە پلەی ئاژەڵان؟ چەند بەئاواتەوەم چارەنووسی ئەسعەد سەعیدی خزمم بزانم، چەند تکا دەکەم بتوانم بەغدا بشۆمەوە و کەمتیار و مارەکانی لە بێخەوە هەڵکێشم و ئەم جۆرەی بەزوڵم و ستەم لەسەر مرۆڤایەتی دەژمێررێت بسووتێنم، بەزەیی لە گیانمدا نەماوە، ئەگەر ڕۆژێک بکارم بەزیندوویەتی بیانخەمە ژێر گڵەوە یەکێ و دووی لێ ناکەم، لە کوێ ئەمە لەدەستی شێتێک دێت تۆڵە لەم سویا توندوتیژە بکاتەوە، کە لەسەر خوێنی قوربانییەکانی دەژێت؟

ڕێ دەکەم و لە خۆم دەترسم، لە کاتی نێوان بێداری و شێتیمدا، لە سەرحان مهاوشی سەرۆک خێڵ دەگەڕێم (تاکو ئێستاکێ گوێم لە هاوار و ناڵەیەتی چۆن لەسەر زۆیە نەوتییەکە خوێن و گۆشتی لەگەڵ پێکەنینە شێتانەییەکانیاندا دەتکێنەوە) لە خۆم دەپرسم دوای ناردنی ئەسعەد سەعید فەرحان بەفەرمانێک ڕەتکردنەوەی نییە، بۆ دەرەوەی شەماعیە، چی ڕووی دا؟ ئەی داخۆ چارەنووسی ئەبول عەسافیر بەکوێ گەیشت، ئەو حەسوونەی وازی لە کێشکە پاسکردن هێنا، ئەمەش دوای ساڵێک لە ئازارگەیاندن بەگونی و شەو و ڕۆژ دارکاری کردنی، کە هیچ ستەملێکراوێک لەم شوێنەدا، کە لەسەر هەڵە و گڵاوی و کوشتن و تێکشکاندنی ڕوح بنیات نراوە، نەیبینیوە؟

بەڕێگەکەی خۆمدا بەرەو گۆڕەپانی تەیەران ڕۆیشتم، پیرەژنەکەم نەبینییەوە، هەواڵیم پرسی، لەوێ کەس شتێکی لەبارەوە نەزانی، نازانم چۆن لەو ساتەدا ئاوەزم جێی هێشتم، لە ناو دووکان و جگەرەفرۆشەکان و هەندێک سەرخۆشدا هاوارم کرد:

– ئەی پیاوکوژان، ئەو ژنەتان بۆ کوێ برد؟ نەفرەت لە باو و باپیری هەمووتان، چیتان لێ کرد، باشە ئەو پیرەژنە چی لێ کردبوون، هەتاکو فڕێی بدەنە بەر مەرگ؟ باو و باپیرتان سەگن و ئێوەش لەوان خراپتر.

ئیتر نەمزانی دوای ئەوە چی ڕووی دا، تەنیا ئەوەندە نەبێت خۆم بینییەوە

جلەکانم جڕ و وڕ بووبوون، لە گۆشەیەکدا بەرماوەی چێشتخانەکان و پیسیی دووکانەکانی لێ کۆکرابوونەوە، تووڕ هەڵدرابووم، نیوەی جەستەشم لە ناو بەرمیلێکی قوپاوی زبڵدا بوو و گوربەیەکیش ئەو وردە ئێسقانانەی پێمەوە نووسابوون، دەیلستنەوە.

***

ئەم ئاریشانەی من پێیاندا تێپەڕ دەبم چارەیان نییە، ڕێگەی چەوت و چەوێڵی نێوان ئاوەز و شێتی بەتەواوی لە پەلوپۆی خستم، لە بێدەنگییەوە بۆ دەنگ باز دەدەم، لە دەنگیشەوە بۆ هاوارکردن، لە هاوارکردنیشەوە بۆ قەشمەرجاڕی، داخۆ بەدرێژایی ڕۆژانی زەڕین و وەڕین چییان بەم جەستە لەڕ و لاوازە کردبێت، لەودەمی دوای نیوەشەو چێژ لە سڕینەوەی مرۆڤایەتیم وەردەگرن؟ چەند دەرگە داخراون و چەند سەنگەریش کراونەتەوە و تووڕیان هەڵدامە ناو چەند داوەوە؟

کێ قەرەبووی ئەو ساڵە بێ ئابڕووانەم دەکات، کە لەوێ ژیام، لە ناو سەرمدا یادەوەرییەکانم دەنووسمەوە، تاکو لە ڕۆژەکانم ڕابکەم، جارێکیان بەدەم ڕێگەوە دەڕۆیشتم، بۆم دەرکەوت هەنگاوەکانم هی خۆم نین، بەڵکو زادەی هەنگاوی کابرایەکی ترن، نەک ئەمە، ئەگەر زمانم گۆ بکات و بێمە گوفتار، ئەوا بەو زمانە گۆ ناکات، کە خۆم دەیزانم. پاشان ئەگەر ئاوڕ بدەمەوە ئەوا کەسێکی بێگانە دەبینم دەکۆشێت لە ناومدا خۆی بشارێتەوە.. خەڵکەکەش ژاوەژاویانە، ئۆتۆمۆبێلەکان تیژ دەڕۆن و بێ ئەوەی لێیان بپرسنەوە مل لە ڕێبواران دەنێن، سوپایەک لە مرۆڤەکان نازانێت بۆ کوێ مل دەنێت و بگەڕێتەوە کوێ، منیش لە نێوانیاندا شێتێکم و کەس ئاوڕی لێ ناداتەوە، لە ڕابوونێکدا پێم گوتن:

- من ئەمین هاشم بەیتارم.

هەموویان بەرابەرێکی ناودار خەنینەوە، کە بەشەقام و ڕێگە و بانەکاندا ڕێی ناکرد، دوای ئەوەی لە یەکەمین ڕۆژەوە بۆ ئەوێیان پەلکێش کرد، حکوومەت کوشتی.. ئەوێ هەمان ئەو شوێنەیە کەس پێی نازانێت، تەنانەت

شـەیتانەکـانیش ناتـوانن (ئەویّ) بدۆزنەوە، کـە منی لیّ بووم، سـیمـای داوەر دەبینم لەسـەر ئێسـقانەکـانم دانیشـتـووە (هیچ سوودێکت نییـە هەی کـەری شیوعی) ڕێگەش چۆڵ و تاریکە، کەچی سەربازەکان ئەو دیوارانە دەڕووخێنن، کە لەسەریان نووسراوە (ئەی دڕندەی مرۆیی، زووبێت یا درەنگ هەر دەمریت) ڕێگەش بەلای باب شـەرجیدا کرابووەوە و بەلای ڕۆژهـەلاتیدا لە قـەد هـەندێک دیوار نووسـرابوو (تا دەتوانیت دەسـتدرێژی بکە سـەر ئافرەتان، بەر لەوەی بێینە گیانت و باجەکەی بدەیتەوە).. بزن دەخەنێتەوە، مەڕەکانیش پێ دەکەنن، ئافرەتان سـەریان لێ شێواوە، کەچی چەقۆکـان ئامادەن بۆ سـەربڕین، کەس بڕوا ناکـات پەیکەرەکـان لە گـۆڕەپانی فـیـردەوس و بازاڕی شـۆڕیجـە و لای پیشـانگەی بەغدا و لە مـووسڵ و بەسرە و میسـان و ناسریـە و تکریتدا تێک دەشکێن، من هـەرگـیـز بەرگـەیانم نەدەگـرت، هەمـوو کـات لە دژایەتی بووم لەگـەڵیـاندا، مـامـۆسـتـا زەکـەریا چووە قـوتابخـانـەی (بلاط الشـهـداء)ـەوە و بەمنداڵەکانی گوت:

- ڕۆڵەکانم بەیانیتان باش.

هیـچ یەکـێک لە قـوتابییـەکـان وەلامـیـان نەداوە، ئەویش بەدڵشکاوییـەوە تەماشـایەکی کردن (بۆ ئەوەندە بێ شـەرمن).. لێ ئەوان زیاتر لە مردوویەکەوە نزیکتـر بوون، چونکە بێ بەرچایی خـواردن بۆ قـوتابخـانە هاتبـوون.. پێش ئەوەی وانە دەست پێ بکات یەکیـان بەلادا هات و گـیانی لەدەست دا. هەینێ زەکەریا چوو بەبەڕێوەبەر ڕابگەیەنێت، بەڕێوەبەر گوتی:

- توخوا زەکەریا ئەوی ڕووی دا مەیگێڕەوە با وەک ئەو نەمرین.

لێ مـامـۆسـتـا زەکـەریا ئەوی بینیـبـووی دووبارەی کـردەوە و بۆ دنیـای گێڕایەوە، کە چی بەسـەر قوتابییـانی (بلاط الشـهـداء) دا هـاتووە، هـەرچەندە دوای ئەوە سێ ڕۆژ ژیا، کـەچی لە ڕۆژی چوارەمـدا لە مـاڵ و ژنەکـەی و منداڵەکانی ون بوو، هەینێ مـامـۆسـتـایەکی تر بۆ قوتابخـانەکـە هات، سێ منداڵ لە برسـاندا مردن، لێ مـامـۆسـتـای نوێ بەخـوێندنی سورەتی فـاتیـحـە بەسەریاندا کۆتایی پێ هێنا و لە گوتاری ڕۆژی پێنجشممەدا گوتی:

انا لله وانا اليه الراجعون.

بەبڕوای تۆ چۆن قوربانییەکان کۆدەکەمەوە و بەرەو بارەگای پەروەردگاری مەزن ڕایان دەماڵم، تا لەوێ لەسەر ئەو تاوان و ستەمەی لێیان کراوە، خوا بەدادوەریی بێگەردی خۆی تۆڵەیان بکاتەوە؟ داخۆ یەکێکیان شایانی ئەوە بوو، کە بەسەریدا هات؟ عەباسی باینجانفرۆش، پارچە پارچە بوو و کۆ ناکرێتەوە، حەسوون عەبدولباری بەدرێژاییی ساڵێکی تەواو چۆلەکەی لەسەر خۆی پاس دەکرد، لەپڕ بۆی دەرکەوت هیچ بەبان سەریەوە نییە، سەرحان مهاوشی سەرۆک خێڵ گۆشتەکەیان لەسەر زۆپە برژاند و ڕۆن و بەز بەلایەکی سمتیدا هاتنە خوارێ، مامۆستا زەکەریا دوای ئەوەی لەبارەی قوتابییە برسییەکانییەوە ڕاستیی گوت، بەیەکجاری ون بوو، ئەسعەد سەعید فەرحانیش، کە ڕۆژێک خۆشیی بەناوەکەیدا نەهاتووەتەوە، لاقەیان کرد و وەک ژن ناچاری سەما و نازکردنیان کرد و خۆشیان بەدەم زەڕینی منەوە، کە بەدرێژاییی مانەوەم لە شێتخانەدا بووە پیشەم، دەیانخواردەوە، چۆن ئەمانە کۆ بکەمەوە، تاکو لەگەڵیاندا بچمە ئەو دنیا و سکاڵا بکەین و ئەوی عەلە و وەلە بەئێمەیان کردووە، باس بکەین؟

ئەوی خراپە بچێنێت، پەشیمانی دەدوورێتەوە، هەموویان شەڕ و خراپەن، چییان بەچی کرد؟ ئەوەتا گشتیان لە ژیاندان، نەوەکانیان لە خۆشییەکدان نەبێتەوە، کۆشک لە عەمان و دیمەشق و بەیرووت و شاریقە، وەکو باپیرە سەرچەوتەکەیان ملیارەکانیان خستووەتە گەڕ و ویژدانەکانی پێ دەکڕن، هیچ خەونێکیان نییە جگە لە خەونی دەسەڵات و شکۆیی و تەمبێکردنی ئەو کەسانەی ڕەتیانیان کردەوە و هەڵیانیان هێنایەوە، خراپەکارییان لە هەر بستەڕێیەک و هەر ماڵێک و ژێر هەر دارخورمایەک و دڵۆپە ئاوێکدا چاندووە، دوورینەوە و بڕینەوەی خراپەکارییەکانیان چارەسەرێکی ڕەوا بوو، کەچی هێشتا شتێک لەمانە ڕووی نەداوە، کێ تۆڵە بۆ کوژراو بکاتەوە و کەنگێ لە بکوژەکەی ڕزگار دەبین؟ میراتێکیان بۆ جێهێشتووین نازانین چۆن پێی بژین؟ گۆڕە بەکۆمەڵەکان پڕن لە لاشە، ئاو بۆ خواردنەوە دەست نادات، بڕێک

داودەرمـان تیـمـاری مـرۆڤـەکـان ناکـەن، تا چاو بڕکـات شـێت دەبینی، دارخورماکان سەریان نەماوە، وێرانەیەک لە ڕوحدایە مەگەر هەر خوا بەخۆی بزانێت چەندە قووڵە، خواردنی بەسەرچوو، زەوییەک یۆرانیۆم تێکی داوە و تا پێنج ملیۆن ساڵی تر جگە لە دڕک و حوشترالووک هیچی لێ ناڕوێت، ئافرەتانێک برسییەتی و نامووسی باڵا ماندووی کردوون، پیاوانێکیش بەدەر لە چەک و کوشتن و ڕفاندن و دەستدرێژیکردنە سەر بانکەکان و کیژانی تازەپێگەییو، هیچ لە ژیان ناگەن.

میراتێک لێوانلێوە لە نۆکەری و سەرشۆڕی و کۆکردنەوەی پارەی حەرام، مەزراکان پاشان قوتابخانە و نەخۆشخانەکانیان تالان کرد، تاکو کۆشکە بڵندەکانیانی لەسەر بنیات بنێن، ئاخۆ هیچ هەڵە و گوناح و سووکایەتییەک ماوە نەیان کردبێت؟ لە هەر هەنگاوێک لە ناو بەغدایا دەبینێم، ئاوەزم ڕکەبەرایەتیم دەکات، جارێکیان لە بەردەم دەرگەیەکدا سەگێک پاسەوانیی دەکرد، بەگژمدا هات، وەڕینەکەی پێش وەڕینم دەکەوت و جاری واش هەبوو من پێشی دەکەوتم، ئەم سەگە لە کوێ دەزانێت من وەک ئەو دەزانم بوەڕم؟

بێدەنگییەکی قورس دای گرتین، بەسەر سەگە زۆرووەڕەکەدا زاڵ بووم، گوێم لێ بوو جەماوەر چەپڵەم بۆ لێ دەدەن، کەچی ئاوەزم لە دەرەوەی سەرمە، هەوڵ دەدەم بیگرم نەکو دەرپەڕێت، ئەز ناپلیۆن پۆناپەرتم.. من هیتلەرم، ئەدۆلف هیتلەر، من ئەو چەقۆیەم بێ بەزەییانە سک هەڵدەدڕم، من هیچ نیم، بێبەریم لە خۆشیی ئاسک و بێستان، ئەز خێزانێکم لە خوێن، هەروەها خوێنیش لە خێزاندا، تەورێک خۆی بەسەرمدا دەکێشێت و خوێنیش لە پێستەکەمەوە فیچقە دەکات، بۆنی شتێکی سووتاو دەکەم، ئەوە بەغدایە.. گڵەکە نەرمە، هەر لەبەر ئەمەشە سوارەکە دەگەڕێتەوە گۆڕەکەی، جەستەیێلێک بێ سەرن، دارخورماکانیش هەر بێ سەرن، ئێمە لە شەڕداین، ئەی جوامێرینە بڵاوەی لێ بکەن، جگە لە سەرگەورەی ماڵانمان کەس لە حاڵی ئێمەدا نییە، نانی سپی و کەباب و هێلکەی کوڵاو، ئەو شوێنەی تێیداین مۆم ڕووناکی ناکاتەوە، دەرگەیەکی داری نەخشین، چۆن لەگەڵ سوارچاکێکی بێ

سەردا بجەنگین؟ بڕوا بەخۆم ناکەم، چۆن ئەو هەموو ساڵە زەردانە ژیاوم بێ ئەوەی جارێک بڵێم (نەخێر)؟ تارمایییلێک لە بەفر، تارمایییلێک لە ئاگر، لەسەرمانە بزانین ئەو ساڵانە لە زەمەنی کوشتن چی ڕووی داوە، لەسەرخۆ، لەسەرخۆ ئەی ئەو مەڕەی گوێدرێژ بوو و ڕۆژێکیان دەزەڕی، بەشێنەیی، تۆ هیچ لەبارەی هیچ شتێکەوە نازانیت، کەرێک و تەواو، تەنیا ئەوەندەت لەسەرە بزەڕیت، تاکو عەریفە کورتەبنە تەنگەزلەکە پێ بکەنێت، تۆ بوونەوەرێکیت ئەگەر بشزەڕیت ئەوا بیر لە شتێک لەوە زیاتر ناکەیتەوە، وا دەزانی من دانم بەوەدا نا، کە دەمزانی؟ چاکە، پێم بڵێن ئەسعەد سەعید فەرحان لەکوێیە، (بەو خوایە) منیش گشت شتێکتان پێ دەڵێم.

***

لەو ڕۆژەی ئاوەزم تێکچووە، وابزانم دوو جاران وتوومە (نەخێر).

## سەفییە

ئەم ئەمین هاشم بەیتارە بەستەزمانە لە شێتەکانی تر ناکات، دەبێت کاتی خۆی تۆقاندبێتیانی، تەنانەت هێند لەڕ و لاوازە مێشێکی پێ ناکوژرێت، یاخۆ من وام دێتە بەرچاو، باشە ئەم پیاوە چرچەوەبووە چی کردووە تا بەدەرزی و کارەبا دەیسووتێنن و ناچاری دەکەن وەک گوێدرێژ بزەڕێت؟

کێ توێژی ڕازاوە و درەوشاوەی بەغدا ببینێت بڕوا ناکات لە پشتییەوە ئەو هەمـوو بەدڕەوشـتی و تاوان و هەڵە و کەوڵکردنەی تێـدا ئەنجـام دەدرێن، زۆرخـۆرییـەکی وا هـەڵە و تاوانـی گـەورە و داوێنپـیـسـیـی بێ سنووری لێ بکەوێتەوە، خـۆم کـورژ دەکەمـەوە ئەم تاقـمـە نابووتە دەبینم، چۆن قـەپاڵ لە جەسـتـەم دەگرن و بەپیسـتریـن سـپێرم و بۆنی بۆگـەن گڵاوی دەکەن، ئەوی تووڕی هەڵدامە ئەم ئاگرەوە و تێیدا سـووتاندمی نزیکترین کەسـی خـۆم بوو، باوکم و براکەم، ئاخۆ ئەمان لەوانە باشتر بوون، کە لێرە بینییانم؟

من لەسـەر ئـارەزووی باوکم بۆ ئەم جـێگەیە هاتم، تاکـو ئابڕووم بشـواتەوە (وەکو دەیگوت)، ئایا باوکم دەزانێت لەم (دێو)ـە ترسناکەی بەتەواوی مرۆڤ لە مرۆڤایەتی دەخات، چی ڕوو دەدات؟

ئەی ئەگەر زانی کچەکەی (سەفییە) بووەتە کەنیزەکێکی هەرزانبەها کێ بیەوێت پێی ڕادەبوێرێ و کێیش بیەوێت گـاڵتە بەمێیینەیی دەکات؟ باشـتر نەبوو بمیدایەتە دەست چارەنووسی خۆمەوە، لەگەڵ کوڕە دراوسێکەمان، کە خـۆشی دەویسـتم و دەیویسـت بمخـوازێت؟ ئێـمـە لە چ وێرانەیەکـدا دەژین، کاتێک ئازیزترین کەسـمـان لە نێو دەمی دڕندەیەکدا جێ دەهێڵین نە دەزانێت بەزەیی چییە، نە لە مانای شەرەف، یاخۆ ویژدان یان بەتەنگەوە هاتن دەگات؟ ناکـرێت ئەم ژیانە بەردەوامی هەبێت، ئەگـەر تێـیـدا براکـەم بڕیار لەسـەر

یەکـلاکـردنەوەی شـتـەکـان بدات، ئەو برایەی گـشت شـتـێک دەکـڕێت و دەفرۆشێت، تەنانەت ئاوی ڕوو و تلیاکیش.

بێ ڕقلێـبـوونەوە ئەم برایەم لە یادەوەریمدا ون بووە، ئەو ترس و سـام و سووکایەتی پێکردنەی بینییانم، ناچاریان کردم ئەو شتە وردانە لە بیر بکەم، کـە لە نـاو خـێزانەکـەمـدا بینیـمن. ئەگـەر ئـەم برا گـێژەم بەنیـوەکـەی تری نهێنییەکانی بەغدای دەزانی، ئاوا بەهەڵە لە نێوان ئەم جۆرە پیاوکوژانەی جێ نەدەهێشـتم، لێ ئەوی لە کوڕە دراوسێکەمـانی بینی، لەو کوڕە شـەیتانانەی نەبینی، کە لەسـەر جەستـەم دەڵەوەڕان، بێ مێشکییش مارکەی فەرمییە بۆ ئەوانەی هیچ شتێک سەبارەت بەنـهێنییەکانی ئەم وڵاتە بۆگەن کردووەی ناو ژێرزەمین و ژووره نووتەکـە شـێدارەکانی بنـەوە نازانن، ئەگەر براکـەمـیان بۆ بهاتایا ئەوا بێبـەری دەبوو لە دنـیا و ئـەوی تێـیدایە، هێـرشی پڕ لە ترس و پەیبـردن بەپەنهـانەکـان و تاوان و سـەرلێـشێـواندن، لە کـوێ براکـەم بەو بێ مـێـشکی و بێنامـووسـیـیـەی خـۆیەوە دەیتـوانی پەردە لەسـەر ئەم نەفـرەتە هەڵماڵێت، کە منی تێ هاویشت.

سـوپاسی پەروەردگار دەکـەم (عـەفرا)ی هاوەڵم لە مـاڵە کـۆنەکـەی خـۆیدا بینییەوە، هەرچەندە وەکو خۆی پێی گوتم بەر لە پێنج ساڵ شووی کردووە، لێ پیـاوەکـەی مـردووە، یاخـۆ ون بووە، دوای ئەوەی بەکـارێک، کە پێی نەگـوت بۆ سلێمـانی چوو، ئێستا هیچ سۆراغێکی نازانێت، پاشان چەندین ڕۆژ و هەفتە تێـپــەڕین هیـچ هەواڵ و ئامــاژەیەکی نیــیــە، ئەمــیش دوای ئەوەی دەرگـە و پەنجـەرەی ئەپارتمانە بچووکەکەی، کە لە (سـاڵحیـە) بوو داخست، گەڕایەوە ماڵی باوکی.

عــەفـرا نازانێت چیم بەسـەردا هاتووە، لە براکـەم هەواڵی پرسـیـبـووم، گوتبووی (چووە بۆ دۆزەخ و حەوت بەرد لە دوای) هـەڵبەت لەوی گوتی ڕاستی دەکـرد، ئەمـیش ئێـتـر لە ترسی سـیـمـای شـەیتـانیی براکـەم پرسـیـاری لێ نەکردبووەوە، وەلێ تێگەیشتبوو شتێکی ترسناک و خراپم بەسەردا هاتووە.

سـەرهـاتی خۆم بۆ گـێڕایەوە، لەگـەڵ شـاردنەوەی هـەندێک لەو تۆقـینەی لە

ساتی خراپکردنمدا تێیدا ژیام، چونکە عەفرا لە شنەبا ناسکترە، ئەگەر باسی خراپەکارییەکانم بۆ بکردایا، ئەوا ژیانی لە پێش چاو دەکەوت و بڕوای بەمرۆڤەکانی تر نەدەما..

لێ هەستی کرد شتێک لە چیرۆکەکەم هێشتا لە لایەکی سینگمدا هەڵگیراوە، ئەو بەخۆی گوتی:

– سەفییە، دەزانم تۆ شتی لەوە خراپترت لێ شاردوومەتەوە.

لەو دەمی سەرم بۆ دەلەقاند، گوتم:

– دروستە، بەڵام با ئەوە بۆ کاتێکی تر هەڵگرین.

چامان خواردەوە، بۆنی تیژی هێل لە پیاڵەکەوە لەگەڵ هەڵمەکەدا بەلووتمدا دەهات، خەریکبوو لە خۆشییاندا بگریم، چۆن بەعەفرا گەیشتم، کە گەڕاندمییەوە دۆخی بێگەردییەکەم، چۆن هاوشان لەگەڵیدا گرم لە پڵیتی یادەوەرییەکانم بەردا، لە یەک قوتابخانە بووین و ڕێگەمان یەک بوو، تەنانەت ستارەی خانووەکانیشمان یەک بوو، تا لێک جیا بووینەوە ئەو کاتی بابم ئەو خانووە گەورە لارەی لە وەشاش کڕی، ڕۆژی بارکردنمان بەلای منەوە کارەساتێکی گەورە بوو، ئەو ماڵەی گواستمانەوە بۆی، باوکم بۆ بەخێوکردنی ئەسپ کڕیبووی، کە پاشان بەبازرگانانی ئەسپی پێشبڕکێی فرۆشتنەوە، بۆنی تەرس و قەستەقول شەو و ڕۆژ لووتی پڕ کردبووم، تەنانەت من هەینێ دەچووم بۆ قوتابخانە و دەگەڕامەوە شەرمم دەکرد، خەڵکەکە تێیان دەڕوانیم وەک ئەوەی بڵێن:

– ئەمە کچی مەیتەرەکەیە.

عەفرا لێی پرسیم، ئەگەر بڕیار بێت خێزانەکەم لە فەرهەنگی ژیانمدا بسڕمەوە ئەی بەتەمای چیم؟ منیش پێم گوت:

– لە ئیشێک دەگەڕێم دوور بێت لە وەشاشەوە، ڕەنگە بچم بۆ بەسرە، یاخۆ مووسڵ.

پێم گوت دەبێ لە دەرەوەی بەغدا بمێنمەوە، چونکە من نامەوێت چارەی

براکەم، یان دایکم ببینم، کە ڕۆژێک پرسیاریان نەکردم، هەروەها ناشمەوێت لە ماڵی باوکمدا بژیم، تەنانەت ئەگەر لەو کارەشیان ژیوان بووبنەوە..

لەو دەمی پڕ قوڕگم لە گریان بوو، پێم گوت:

– ئەو دە ساڵە فێریان کردم بەرابەر بەخۆم دڵڕەق بم، ئەویشی لە شەماعیە بینیم یارمەتیی ئارامگرتنم دەدات، مادامەکی ئەوی دوای ئەمڕۆ دێت لە ڕابردوو خراپتر نابێت، پێویستم بەبڕێک پارەیە تاکو سەفەر بکەم، هەرچەندە بەئاواتەوەم لێتەوە نزیک بم عەفرا..

ئەوی لە دڵمدا بوو لە ئێش و ئازار و حەسرەت و برسییەتی بۆ ژیان پێم گوت، گەلێک گریام و فرمێسکەکانم بەجلەکانی ئەو سڕینەوە و ئەویش لەگەڵمدا گریا.. شتێک دەسووتێت، ڕەنگە هەستەکانی ئەو بن، پریشکی سووتانەکەی منیان بەرکەوتبێت..

عەفرا بەهێمنی و بەدەنگێکەوە لە نوێژکردنی دەکرد، گوتی:

– سەفییە، خۆت چیت پێ باشە ئەوە بکە، ئەوەندە پارەم هەیە بەشی ڕۆیشتنت دەکات بۆ ئەوسەری دنیا، لە هیچت کەم نییە، تۆ بەخۆت ژیر و جوانیت، ئەوەندەت بەسە لە خۆڕا بەسەرتدا هاتووە، ئەگەر ژیان پڕ بوو لە پەشیمانی شایانی ئەوە نییە تێیدا بژیت.

لەودەمی ڕۆیشت کێک و دیسانەوە چا بهێنێت قسەکانیم دووبارە دەکردنەوە. ئەگەر ژیان پڕ بوو لە پەشیمانی هەرگیز شایانی ئەوە نییە تێیدا بژیت.. چایەکە بەسەر جلەکانمدا ڕژا و سووتاندمی، کەچی هەستم بەهیچ شتێک نەکرد، ئەم ئاگرە لەگەڵ ئەوی منی تێدا بووم بەراورد ناکرێت، عەفرا داوای لێبووردنی لێ کردم، کەچی من تەنیا گوێم لەو قسەیەی بوو و دووبارەم دەکردەوە و زایەڵەیەک لەودیو دیوارەکانەوە دەهات خەریک بوو دەیخەواندم، زایەڵەیەک دەیگوت:

خەڵکە چاکەکە کردەوەی خەڵکە خراپەکە دەسڕنەوە.. نزیکترین کەسی لەدەست دام، وەکو پارووییەکی چەور و نەرم بۆ قەپاڵی زۆرێک لە دڕندەکان

جێیان هێشتم، پاشان لەولاوە عەفرا دێت و ئەو خوێنەی بەخوار ناوکمەوە نووساوە، دەسڕێتەوە و باسی ئەو پارەیەم بۆ دەکات، کە بەشی سەفەرەکەم دەکات تا ئەوسەری دنیا.. گوێم لێیە دەڵێت:

- سەفییە چیتە؟ ئێمە لێرەین گوڵم.. چی ڕووی دا؟ تۆ لێرەیت، لە ماڵی منداڵیت.

چایە گەرمەکە چووە خوارەوە و پێستەکەی دەسووتاندم، کەچی من هۆبەی ژمارە (٩)م بیرهاتەوە، بێ ئەوەی بەخۆم بزانم پڕ بەدەمم قیژاندم:

- بەسە، بەسە، بەرازینە تێر نابن؟

## ئەسعەد سەعید فەرحان

چ بۆ خۆم و چ بۆ ڕووبارەکە بەکوڵ گریام، لە پڕ بۆم دەرکەوت ئیتر شتێک نییە لە بەغدا قەدەغە بێت، دەتوانم لە بەرابەر کۆشکی کۆماری، کە تەنانەت سەگە پاسەوانەکانیش جێیان هێشتبوو، بەکەیفی دڵی خۆم مەلە بکەم، دەکارم لەسەر پردی هەڵواسراو ڕێ بکەم بێ ئەوەی کەس بەقەنارەمدا بکات، دەتوانم جووتێن بەورچە سپی و ورچە ڕەش بدەم بێ ئەوەی زمانم لە بنەوە ببڕن، دەتوانم بڵێم (نەخێر) و هیچ جەندرمەیەک نەیەت بەپاساوی ناپاکی گوێیەکانم ببڕێت، دەتوانم لە سەربانی ماڵی خۆماندا بنووم و دەنگی تەلەفزیۆنەکە کز بکەم، ئینجا دەست بەپەتاتەخواردن بکەم و ئەو وێنانە جڕووڕ بکەم، کە شیریان لە دەمی منداڵەکانمان کردەوە (پتر لە سێ ملیار وێنە لە دەرەوە و ناوەوە چاپکراون، لەو دەمی بەسەر ئەسپە سپییەکەیەوەیە، لە عانی چاخواردنەوەدا، لەو کاتی کیژە لەڕ و لاوازەکەی بەسەر شانیەوەیەتی و سیگاری هاڤانا دەکێشێت، هەینێ گاڵتەمان پێ دەکات، لەو دەمی تەقە بەبان سەرماندا دەکات، کاتێک بەسەر چیایەکی کوردستانەوەیە، وەختێک ئامێزی لە وەزیری بەرگرییەکەی داوە، کە بەخۆی فەرمانی کوشتنی بۆ دەرکرد، لەو کاتی ئۆتۆمۆبێلەکەی لێدەخوڕێت، لە کەعبەی شەریفدایە، لە مەزارگەی حوسێندایە، گوللە ڕووەو ئێران دەتەقێنێت، لە جەژنی نەورۆزدا لەگەڵ کورداندا هەڵدەپەڕێت، شیرەکەی بەرز دەکاتەوە، تاکو ملی خۆمانمان لە بیر بێت، لە خوا دەپاڕێتەوە بمرین، لەسەر زەویی هەزار ئاسا دانیشتووە، لە یەکێک لە کۆشکە مەحکەمەکانیدا ڕاوەماسی دەکات) سێ ملیار سووکایەتی بەیەکسانی بەسەر وەزارەت و باڵیۆزخانە و چایخانە و شەقام و ماڵ و تەویلە و قەحپەخانە و دەزگەکانماندا دابەش کراون، تەنانەت

چێشتخانە و سەربازگە و ئاودەستەکانیش لەم سووکایەتی پێکردنە نەبوڕرراون، لەمانەش تێر نەبوو، بەڵکو هەستا لەسەر کاژێر و قاپ و تەپڵەی جگەرە و فانیلەی داروودەستەکەی و لەسەر ئۆتۆمۆبێل و شەمەندەفەر و کتێبی قوتابخانەکان و قاوغە شەمچەشی چاپ کردوون، هەروەها بەئەنقەست گاڵتەی بەپەروەردگار کرد و وێنەی خۆی لە قورئاندا کێشا، جگە لەوە قەشمەریی بەگشت میللەت کرد، کاتێک وێنەی لەسەر پاسەپۆرت و بڕوانامەی ڕەوشت باشی و دەفتەری خزمەتی مەدەنی و سەربازی مۆر کرد، هەروەها فەرمانی دا قورئان بەخوێنی ئەو بنووسنەوە.. ئەگەر کۆتایی پێ نەهاتبا ئەوا تاقگەکانی (بێخاڵ)یشمان لەدەست دەچوو، کە دەیویست بکەوێتە ناو کۆشکی حەفتایەمینییەوە، ئەوەبوو چارەنووس ویستی سروشت بەئازادی و خاوێنی و دوور لە گڵاوی و شێتییەکەی بمێنێتەوە.

***

شتێک نەماوەتەوە قەدەغە بێت، فریشتەکان دوای بزربیەکی خەمهێنەر ئێستا دەتوانن لەسەر زەوییەکەمان بنیشنەوە، لێوەکانیش مافی خۆیانە پاش ئەوەی کامەرانی جێی هێشتن، زەردەخەنە ببارێنن، ئەو تەلەفزیۆنەی جگە لە وێنە مرومۆچەکەی هیچمان تێدا نەبینی، ئێستا دەگەڕێتەوە لای خاوەنی خۆی، دیجلەش گەر ڕۆژێک وشکی بکردایا، لە خۆشییاندا دەگرییێن و ئەشک دەڕێژین، تاکو پڕی دەکەینەوە و لە ناو شەپۆلەکانیدا مەست دەبین، کە هەزار ساڵ سەبری گرت و چۆن ئێمە سکالامان لە دەست سەرشۆڕی دەکرد ئەویش بەهەمان شێوە. شتێک دەسووتێت، وابزانم ماسیی برژاوە، کە سەرلەنوێ لە شەقامی ئەبی نوئاس دەیبرژێنن، ئەو ئەبی نوئاسەی کوشتیان.

ئەم ئێوارەیە وا هەست دەکەم دوای بڕینی چەندین ئەستەم لە وێرانەیەکەوە بۆ وێرانەیەکی تر، ناوەکەمم بۆ گەڕاوەتەوە، تێربووم لە تاریکیی زیندانە تاکەکەسییەکان و ژوورەکانی خوارەوەی ژێرزەمینەکانی دەزگەی هەواڵگری، تێربووم لە لێدان و جوێن و دەستدرێژیکردنە سەر گۆشتم و پیاوەتیم، ئیتر لەسەر جەستەمە تۆڵەی خۆی لە ژیان بستێنێتەوە، ئەی مافی خۆم نییە تۆڵە

لەو دڕندە مرۆییبیانە بکەمەوە، کە پەلاماری ئێسکوپرووسکیان دام؟ لە کوێ بیانبینم لە کاتێکدا هەڵاتوون؟ خۆ ئەگەر بیانیش بینم چۆنیان بناسمەوە؟ هەموو شتەکانیان لەودیو چاویلکە ڕەشە پانەکانیانەوە دەکرد، کە چاو و زۆرێک لە سیمایانی دەشاردەوە، دەنگی هەر یەکێکیانم لە یادە، ئەمەش تاقە شتە بمباتەوە سەریان، بەتاوانەکانیانەوە هەڵاتن و ئاوا بەئاسانی نادۆزرێنەوە، جوێنەکانیان لە لێدانی قامچی و پۆستاڵ و ئەو دارانەی منیان پێ وردوخاش کرد کاریگەرتر بوون.. کچی باوکی خێراکە، بۆ کوێ؟ پەلە بکە ئەی سووکی سۆزانی، بەڵێ، پەلە دەکەم، بەلام بۆ چ لایەک؟ قاترە جوانەکە خێراکە، هەی ئەسعەد سەعید[٢] لە جیهاندا، ئەوان دەخەنینەوە، منیش لە ڕێگەمدا بەرەو پێشاو دەکەوتمە خۆ، بۆ ژووری لێکۆڵینەوە لەز دەڕۆیشتم، پەلەم دەکرد لە هێنانەدی حەزەکانی نیوەشەویان تا گزنگدان، لێ گشت ئەمانە هاوتای ئەوە نەبوون بۆ بینینی ئەمین هاشم بەیتاری مامۆستام بردمیان، ناچاریان کرد بزەرێت، تاکو بەگوێی خۆم بیبیستم، بەقەد ئەوە نەبوون لە بەرابەر ئەم خزمەمدا پێیان کردم، جلەکانیان لەبەر داکەندم و زەبروزەنگیان لە بەرابەردا دەنواندم، تاکو بمبینێ و بڕوا بەوە بهێنێت، کە خوا پشتی لە ئێمە و لە هەموو بەغدا کردووە.

– تەماشاکە و چێژ وەرگرە هەی ژنانی، ئەمە گەورە و خەمخۆرتانە، داخۆ پێویستتان بەڕابەرێکی کەری وا هەیە؟ ئەوەتا دەزەڕێ و باشترین کەری دنیاش.. ڕابەرێکی کەری پلە نایابە، کە بەڕاستی ئێوە ئاتاجین.

ئەمین هاشم بەیتار دانەری کتێبی (لە بێدەنگییەوە بۆ دەنگ) هێندیان دارکاری کردووە و کارەبایان لێ داوە و حەبیان داوەتێ، بووەتە گوێدرێژ، ئەمین هاشم، ئەو کەسایەتییەی لە ژیان و سیاسەتدا عەشقی شێوازەکەی بووین، دەزەڕێت؟ ئەمە ئەو ئاستەیە مرۆڤایەتی پێی گەیشتووە و دوای ئەمە هیچ نییە.

---

(٢) ئەسعەد سەعید: بەختەوەرترین بەختەوەر.

له کتێبەکەیدا (فۆتۆگرافیای فەرمانڕەوای نموونەیی) شتێکم خوێندەوە وای لێ کردم نیوەی ڕۆژەکە بیر لە نەهامەتیی عەرەب بکەمەوە، ئەوەتا سەرکردەکان ئەوە دوای ئەوە هێلانە لەسەر سەرمان دەکەن، بێ ئەوەی بڵێین (بەسە ئیتر کەللە سەرمان هەڵکۆڵن، لەبەر قورسیی شەڵتان داڕزا).

هەر جارێک لە خوێندنەوەی دەبمەوە، دوای مانگێک دوو مانگی تر دەگەڕێمەوە سەری، تاکو لە ڕاستیی مەودای نێوان فەرمانڕەوا و ژێردەستە بگەم، وابزانم سەرلەبەریم ئەزبەر کردووە و تا نەکەوتمە (ناویانەوە) هەر لەبیرم مابوو، ئینجا ڕاستیی بۆچوونەکەیم لەبارەی ڕێژەی دڵڕەقییەوە بۆ دەرکەوت، کە شایان بەگەلانە، تاکو چۆک دابدات و بترسێت و ئەوی بڕوای پێ بووە لە بیر بکات، لە کتێبەکەدا هاتبوو:

– فەرمانڕەوای نموونەیی پێویستی بەبەزەیی و دادپەروەری و دڵڕەقییش هەیە، میللەتان تاقە دۆخێک نین، خەڵکەکەش بارودۆخ و ئایدیۆلۆجیا و ئارەزوویان چونیەک نین، ئەوی فەرمانڕەوایی بەسەریدا دەکات، دەبێت جیاوازییە چینایەتییەکانی لە بیر بێت، کە هەموو کات و بەردەوام یەکەمین هۆی تاوان بوونە لەو کۆمەڵگانەی بەدەست ئەو جیاوازییانەوە دەناڵێنن، ئا لێرەدا ئەو فەرمانڕەوایە بەدەردەکەوێت، کە ئێمە دەمانەوێت، ئەو فەرمانڕەوایەی لەگەڵ ئەم جیاوازییانەدا هەڵدەکات و دەزانێت چۆنیان دەست بەسەردا بگرێت، نەکو ببنە ئەو پریشکەی دەسکەوتە مەزنەکان بسووتێنێت، دووریش نییە ئاگرەکە بگاتە داهاتوو و بەر لەوەی بچینە ناویەوە ئەویش بسووتێنێت، هەرچی زەبروزەنگە ئەوە شێوازی سەرۆک و پاشا و سوڵتانە ترسنۆکەکانە، هەر فەرمانڕەوایەکیش لەگەڵ میللەتەکەیدا دڵڕەق بێت، ئەوا لە بەڕێوەبردنی کارەکانی وڵاتدا لە گشتیان لاوازتر و بێ مێشکتر و گەمژەترە.

ئەم پیاوە دەستپاکەی کورسی و خۆشنوودییەکانی ڕەتکردەوە، هەروەها ئەو ماڵە خۆش و ڕازاوەیەی وەلا نا، کە لە یەکەمین ڕۆژەکانی بەرەی نیشتمانیدا پێیان بەخشی، نەک هەر ئەمانە بەڵکو ئەوەشی ڕەتکردەوە ببێتە باڵیۆز، یاخۆ وەزیر، لە حکوومەتێکدا لەوەی دەکرد جۆری کانزاکەی زانیبێت

و زووش پەردەی لەسەر سیما شێواوەکەی هەڵدایەوە، ئێستا ئەمین هاشم بەیتار تەنیا گوێدرێژێکە و زەڕە زەڕ دەکات، تاکو ئەوانی لە بنی بنەوەی مرۆڤایەتین پێی راببوێرن و کاتی پێ ببەنە سەر.

لە مێشکی خۆمدا گوتم: ئەگەر من وا بمێنم لە داخاندا دەمرم، ئەگەر ئەو هەستی تۆڵەسەندنەوەیەم بەردەوام بوایا ئەوا نەمدەتوانی بەزیندوویەتی بمێنم، چووم بۆ ناو خەڵکەکە، ئەو خۆشییەم بینی گۆڕەپانی فیردەوسی گرتبووەوە، لەو شادمانییەدا بەشداریم کرد، کە بڕوا ناکەم دوای ئەم ڕۆژگارە لە هیچ سەردەمێکی تردا دووبارە ببێتەوە، خەڵکەکە لە قوولاییی هەستکردنیانەوە بەو ناماقووڵەی ڕووی داوە، جۆرە (شێتی)یەک دای گرتوون، لەگەڵ دروستبوونی دنیادا شتی وای بەخۆیەوە نەبینیوە، وڵاتێک نییە لە سەرتاپای زەویدا لەم خۆشییە گەورەتری بینیبێت، کە دەریان بپەڕێنێتە شەقام و ماڵ و کۆڵانەکانەوە، مەست و مەستیش نەبوون، خۆشییەک دای گرتبوون جەستەی مرۆیی بەخۆوەی نەدەگرت، زایەڵەی تاقە دەستەواژەیەکیان لە ئاسمانی بەغدادا دووبارە دەبووەوە:

- سوپاس بۆ خوا نەمردین و کۆتاییانمان بینی.

منیش لە هەموو ساتێکدا دووبارەی دەکەمەوە، لە هەر بستە زەوییەک بەسەریدا بڕۆم، تەنانەت منیش تووتی ئاسا دەمگوتەوە و هەرگیز فێری شتێکی تر نەبووم:

- سوپاس بۆ خوا نەمردین و کۆتاییانمان بینی.

## ئەمین هاشم بەیتار

جلەکانم یەکپارچە بەقوڕەوە بوونە، قوڕەکەش بەخوێنەکەمەوە نووساوە، خوێنەکەشم بەفرمێسکەکانم، یەکێک لەسەر ڕووی دیوارەکەی نووسی (ئەم چەرخە وەستانی بۆ نییە، ڕۆژێک دوژمنتە و ڕۆژێک دۆست) لەولاوە یەکێک لەسەر ڕووی هەمان دیوار نووسی (مێزکردن بۆ کەر) قسەیەکی تریش بەدرێژایی دیوارە درزبووەکە نووسرابوو (ئەم دۆخە بەردەوامیی ئەستەمە) سەرم هەراسانی کردبووم، نازانم چیم بەسەردا هات هەینێ لە دوا جاردا ئاوەزم لێم جیا بووەوە، ئەمە چ دیوارێکە، گشت جۆرە نووسینێکی لە خۆ گرتووە، تیزەجارییەکە ئەوسەری دیار نییە (پارە سەرچاوەی کاری چاکە بۆ پیاوباشان، سەرچاوەی خراپەشە بۆ بەدکاران) ئەوەم بەبیردا هات سەگێک هات گازم لێ بگرێت، هیچ شوێنەواری برین بەجەستەمەوە نییە، خوێنی لووتم بەربووە، ڕەنگە کەوتبێتمە سەر زەوی، نا، دوور نییە یەکێک لە ڕێگە لێی دابم، هیچم بەبیردا نایەت، کاتێک خۆم بۆ هەر کەسێک ئاشکرا دەکەم بڕوام پێ ناکات، لە ناکاو شتێک لە خوێنبەرەکانی سەرمدا تێک دەچێت و دەست دەکەم بەجوێندان بەخەڵک و حکوومەت و بەدەنگێکی ناسازیش بەردەوام دەزەڕم، تاکو ئاوەزم دێتەوە سەر خۆی، هۆش و هەستم لەدەستداوە و لە نهێنیی خۆم تێ ناگەم، داخۆ ئەم زۆڵانە چییان لێ کردووم؟ ئایا شکاندنی پەیکەرەکان بەسن بۆ تۆڵەسەندنەوە لەوەی کردیان؟ ئاوەزم کە بەتەواوی لەدەستم دا، چۆن دەکرێت بگەڕێنرێتەوە سەر موولوولە و دەمارەکانی، تاکو قسەیێلێکی وا بڵێت خەڵکەکە بڕوای پێ بکەن؟ چیرۆکی خۆم بۆ کێ بگێڕمەوە دوای ئەوەی شێوەم زیاتر لە شێت دەچێت، تەنانەت ئەو جلانەش، کە پیرەژنەکە پێی بەخشیم پینە پینە و جڕوور بوونە و ڕیشووەکانیان بەدەم بایەکەوە دەفڕن و لە هیندییە

سوورەکان دەچم، منداڵانی گەڕەکەکان پێم ڕادەبوێرن و بەهۆیهاوە دەکەونە دووی شـێتـێکی پێکەنین هـێنەر ڕۆژانێک ناوی ئەمین هاشم بەیتـار بوو، کـە چەندین ســاڵ لە پەتپــەتێنی حـزبایەتی ڕێژیمی تۆقـاندبوو، تاکـو حکوومـەت دەستی لە شـەرەفی خـۆی بەردا و هەمـوو ڕێککەوتننامـەکانی وەلا نا و میـزی بەسـەر ویژدان و ناویدا کرد، من یەکەمین کەس بووم پەلکێشی کوشتـارگەیان کردم، بەقسەی ژەهراوی و هەنگوینی سەنگوسووکییان لەگەڵدا کردم، پۆستی بەرز، باڵیــۆزخــانەی ولاتێکی مــەزنیــان خــستــە بەردەمم، کـەچی ویژدانم، لەوانەشـە بێ مێشکیم، لێ نەگەڕا ئەو دەرفەتە بقۆزمـەوە، بەسـەدان جار پێم گوتن (نەخێر)، بەڵکو گاڵتەم بەو کردەی کڕین و فرۆشتنەش کرد، کە پێکەنینم پێیدا دەهات، ئیتر تێهەڵدان و دار تێ بڕین و بێ ئابڕوویی درەنگوەخت بەدەم خـواردنەوە و زەڕینەوە، تاکو ئاوەزم لەدەست دا، بیرمـە چۆن لەو ژێرزەمینەی پڕ بوو لە وێنەی سـەرۆک لەو دەمـی بەدەم بزەخـەنەیەکی درۆزنانەوە تەمـاشـای (گەلەکەی) دەکات، لە بەرابەر کامیرای تەلەفزیۆندا دایاننام، هەتا قسەیێلێک سەبارەت بەیاسـا و ڕاستی و دۆستایەتی و نیشتمانپەروەری و سەرڕاستی و دانایی و ژیان بکەم، قسـەکانیش وەکو خـۆیان دەخـوازن دەردەچن نەک ئەوی من گـوتم، بەم ئاوایە بەڕیشـم خــەنینەوە و ئەو قسـانـەیان بۆ لێ دام، کـە لە شاشەکەوە بیستمن:

حزبی شیوعی بووە بەبەشێک لە ڕابردوو، لەسەر هاوڕێیانە بێ سـەرێشـە و دروستکردنی شتی بێ مانا خۆیان بدەنە دەستەوە، ئیتر هەموو شتێک تەواو بوو..

دەنگەکــە دەنگی من بـوو، قــورگم بوو، ئەرێ مـن شـــتـێکی هـەرزانـی وام گـوتووە؟ بەڕاســتی ئـەوان لە خـەوشـداركـردنی ژیاندا لێـهـاتـوون، ئامـێـرێلی کردنەوە و بەسـتین و مـشـار و کـردنەوەی پەراسـووی وایان هەن، تا شــەیتـان حەز بکات دەمێنن.

ترس و تۆقـین یەکـەمین چەکـیـان بوو بۆ دەمـکوتکردن، ئەوی بـەمنیـان کـرد تەنیا بەشێکی نەرم و بچووک بوو لە ئامێری ترساندن و تۆقاندن، کە چەندێک

زارمترەکتر و پتر بترسایناپا، ئەوەندە بەردەوامتر دەبوو.. ئەی چی دەبوو ئەگەر وەکو بالیۆز بچوومایا بۆ مۆسکۆ، یاخۆ ئەندەنۆزیا، یان مەدرید، ئەو ولاتانەی بەر لە گرتنەکەم پێشنیازیان بۆ کردم؟ ئەوا ئێستا لە تەواوی ئاوەزی خۆمدا دەبووم، لەوانە بوو هێند پارەشم دەست بکەوتایا بەشی سەرلەبەری ژیانی دەکردم، لێ من وام زانی لە ڕەچەڵەکی مرۆڤن، دەکرێت لەگەڵیاندا لەسەر بەرەیەکی نیشتمانیی ڕاستخواز ڕێک بکەوین ببێتە و بناغەی یەکێتی بۆ عێراقێکی بەهێز و دەوڵەمەندی وا مادامەکی سامانمان بۆ سەرجەم گەلە، هیچ نەدارێکی تێدا نەبێت، من ئەو کات لە کوێ بمزانیایا لە ژێرەوە خەریکی چاوبرسێتی و لەخشتەبردن و تاکڕەوی و عەشقێکی نەخۆشی دەسەلات و پارەدزینن؟

تەنیا نیو کاژێرە و دیسانەوە تووڕەییەکەم دەستی بەسەرمدا گرتەوە و بەرەو شێتی بردمی، پیاوێک لە دەرەوەی سەردەمەکەیەتی، جگەرەکان بێ دووکەڵن، شەویش (وەکو پاڵتۆ تەڕبووەکەت درێژ و شێدارە، ئەستێرەکان لە شێوەی قۆپچەکان دەردەپەڕن، دەلاقەی سینگت دەڵێیت کەنداوە، سەرما لە بەردەکانی دەدات، ڕووباری کەزییەکانت زایەڵەی ناو دۆڵێکە کۆ دەبێتەوە، تاکو ڕەش دادەگیرسێت، شێوەی ڕووخساریشت ئەوسەری پەناگەی بایەکانە. لێت ناپرسم تۆ کێیت، وەلێ لە خۆم دەپرسم من بێ تۆ کێم؟)(*).. هاوار دەکەم، کەس هێندەی من لە زەڕین ناگات، من کەرێکم بەڕووناکی و کامەرانی خەت خەت کراوم، من پاشای سەر زەویم، من بکوژ و کوژراوم، من ئەمین هاشمی گوێدرێژم، هێند سەما دەکەم، تاکو قاچەکانم شەکەت و ماندوو دەبن و دڵیشم لە ترپە و نرکە و ناڵە دەکەوێت، من شەمەندەفەرم و هەر بەخۆشم تاقە سەرنشین و بلیتبڕ و لێخوڕ و ئاسنەڕێیەکەم، من شەمەندەفەرێکی سەرسەختم، تووت، تووت، تووت، سوودی ڕابوونەکەم چییە، کاتێک لە شێتییەکەم بێدار دەبمەوە دوو هەنگاوی تر لێی نزیکتر دەبمەوە؟ ئاوەزداران کاتیان شانبەشانی کاتی شێتی نییە، چووم بۆ گۆڕەپانی تەیاران تا

---

(*) فەوزی کەریم (نووسەر)

دیسانەوە لە پیرەژن بگەڕێم، گوتم بەڵکو گەڕابێتەوە شوێنی خۆی، تەنیا ئەو دڵی بەڕوحە تینوو و سەرە پەتیارەکەم دەسووتا، کەچی لە شوێنی ئەو یەکێکی ترم بینی هێلکە و عەنبە و نانی گەرمی دەفرۆشت، پرسیاری پیرەژنم لێ کرد، کە بەر لە ماوەیەکی کەم لێرەدا بوو، کەچی گوتی:

– خوا لە گوناهی هەمووان خۆشبێت.

بێ ئەوەی پرسیاری شتێکی لێ بکەم، کولێرەیەک و هێلکەیەکی پێ دام کرابووە دوو پارچەوە، لەگەڵ کەرتێک پیوازدا، پێش ئەوەی بڕۆم، گوێم لێ بوو دەیگوت:

– پیرەژن بۆ تۆ ڕای سپاردم، گشت ڕۆژێک وەرە و چیت دەوێت لە خواردن ببە..

خەریکبوو بۆ ئەو گەدایە دەگریام، کە خۆم بووم، وێڕای ئەوەش هێلکە و پیاز و کولێرەکەم خواردن، ئینجا چایەکەم خواردەوە و ئەندەنۆزیا و مەدرید و مۆسکۆم بیر دەهاتنەوە، کە دەبوو لە یەکێک لەو بەهەشتە پاکانەدا باڵیۆز بوومایا، نە مردن نە گوللە نە شێتی، هەینێ بیرم لە شەقامەکانی ئیسپانیا دەکردەوە لە چاوترووکانێکدا ئاوەزم لێم جیا بووەوە، دەبوو گەمژەیەکی وەکو من لەوێ زۆرانبازیی لەگەڵ گادا بکردایا، چونکە هێشتا باشتر بوو لە گایەکانی بەغدا، گایەلێکی قۆچدار ناگیرێن تاکو هێرشیان بۆ دەبەیت، گایەلێکیش بێ ئەوەی لێیان نزیک ببیتەوە شاڵاوت بۆ دێنن، لە ترساندا دەلەرزیم و دەمشیراند:

– بژی ئەوی دەڕووخێت، بڕووخێت ئەوی دەیەوێت بژێت، لەمڕۆ بەدواوە نە هیتلەر و نە بەرلین و نە مەنجەنیق و نەیش پەقلاوە، پێم گوتن، من شەمەندەفەر و من تاقە سەرنشین و من ئاسنەڕێم، بۆچی کەسێک لە ئێوە بڕوام پێ ناکات، هەی کەرینە؟ وەرن لەگەڵمدا سواربن، تووت.. تووت، تووت..

***

بارگەیەکی کارەبایی بێدارم دەکاتەوە، بارگەی دووەم دەمکوژێنێتەوە و تێکم

دەشکێنێت، جەستەم چی پێ بڵێی دەیکات، وێڕای ئەوەی هەڵاتن، مێردەزمەکانیان لە ژێرمدا بەقووڵی هەن، لە ژێر پێستەکەم، لەسەر سەکۆی ماڵێک دادەنیشم و چاودێریی خەڵک و ئاسمان و پشیلە بەرەڵاکانی دەوروبەرم دەکەم، زەلامێکی گرژ و مۆن هاتە لامەوە و داوای لێ کردم لەبەر دەرگەی ماڵەکەی لاچم، لەو دەمی بەبارگرانییەوە هەستام چوومە شوێنێکی تر، گوێم لە کابرای مۆنە بوو بەچرپەوە گوتی:

- شتی وا ئەستەمە، لە ئەمین هاشم دەچێت.

پاشان زرمەی لە دەرگەکەوە هێنا، لێ دەرفەتم بوو بۆ ڕزگاربوون، دەبێت پێی بڵێم من ئەو ئەستەمەم، کە لە مردن گەڕاوەتەوە، کەچی جێی هێشتم و پرسیاری نەکرد، منیش هیچم بۆ نەمایەوە ئەوەندە نەبێت دووبارە لەسەر سەکۆی ماڵەکەی دانیشمەوە، تاکو یەزدان ڕێی دەرچوونی لە ماڵەوە دەدات، بێهوودە کات تێ دەپەڕی، ئەوەتا خەریکە ئاوەزم فەرامۆشم دەکات، هەر هێندەی شێتییەکەم دەست پێ بکاتەوە، چی بکەم کەس بڕوام پێ ناکات.

گومانی تێدا نییە ئەو کابرایە دەمناسێت، دووریش نییە لە شانەکەی مندا بووبێت، باشە چۆن توانی لە دەستیان قوتار بێت؟ یاخۆ ڕەنگە لەو جەلادانە بێت کەوڵیان دەکردین و پێمان پێ دەکەنین، لە سۆنگەی ئەمەشەوەیە دەرگەکەی داخست بێ ئەوەی وڵامی لە دەرگەدانەکە بداتەوە.. گرینگ ئەوەیە ئاوەزم بپارێزم بەڵکو شتێکی لێ هەڵکرێنم، نیشانەی ئێکسم لەسەر دەرگە دارینەکە جێ هێشت، تاکو لە یادەوەریمدا بمێنێت، لە ترسی ئەوەی نەکو ئاوەزم دوای کاژێرێک، یا دووانی دی جێم هێڵێت.

لەسەر سەکۆی ماڵەکە کەوتمە سەماکردن، (طالعة من بيت ابوها)،[٢] کەس لە کۆڵان لە هۆڵی مندا نییە، پشیلەیەک، یاخۆ گوێدرێژێکیش بەلای مندا ئاوڕ ناداتەوە، سەرەڕای ئەو شێتییەی دابەزییە سەر سەرم، تەماشای نیشانەی (ئێکس)ـەکەم دەکرد نەکو ماڵەکە لە

---

(٢) گۆرانییەکی عێراقییە، سترانبێژ نازم غەزالی دەیڵێت. (و)

دەستم ڕابکات، کابرای مچومۆڕ لە قەفەسەکەی بەدەوریدا چنرابوو، هەڵهات، بوو بەهەڵم، جا سوودی چییە ئەگەر ئەم سەگە (ئاوەزم) وەکو سەگەکانی تر ئەمەکدار نەبێت؟ ئەو هەینێ لەگەڵمدا دەبێت، وەکو بلیمەتێک دەمدوێنێت، کاتێکیش جێم دەهێڵێت بەقامچیی ئاگرین دارکاریم دەکات، چیم لەدەست دێت جگە لەوەی ڕێ بکەم و بایدەم و دەست لە ڕێبواران پان بکەمەوە (بەیارمەتیت جگەرەیەک) شێت و بڵێت بەیارمەتیت، بۆ نا؟ تەنانەت شێتەکانیش لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا گۆرانیان بەسەردا هاتووە، وەرە جگەرەکەت لێرە بەبادا بدە، پارەی جگەرەیەکت نییە؟ بەر لە چەند ڕۆژێک چوار دینارم هەبوو، بەو پارەیە هێلکە و تەماتە و پیازم خوارد و چایەکی زۆرم خواردەوە.. جا لە زستان و هاویندا بەتامە، لەنکاوڕا، کابرای مۆنەم بینی چەمەدانێکی (جانتا) ڕەشی بەدەستەوەیە، پەلامارم دا و قیژاندم:

– ئەمە یەکێکە لەوان.

کەچی لە دەستم ڕزگاریان کرد، یەکیان گوتی:

– لێی مەدەن، بەستەزمانە، ئەم پیاوە ئاگای لە خۆی نییە، بەزەییتان پێیدا بێتەوە.

لە یەکەمین دۆخی بەئاگاداهاتنەوەدا بۆم دەرکەوت کابرای مۆنە کوێخای گەڕەک بوو، ئەو مۆنییەشی دۆخێک بوو لە پیشەکەی، لێ کاتێک بینیمی گوتی (شتی وا ئەستەمە، لە ئەمین هاشم دەچێت)، باشە من چی لەگەڵ کوێخای گەڕەکدا بکەم ئەگەر بەخۆی کەسایەتیی منی ناسیبێتەوە؟ نەمتوانی بەدوویدا ڕابکەم، ئەو لە کوێ دۆخەکانی دابڕینی من لە نێوان ئاقڵی و شێتیدا بزانێت؟ ئاخۆ من نیوە شێتم، یاخۆ نیوە ئاقڵ؟ بۆچی نامەیەکی بۆ نەنێرم ئەوی ڕووی دابوو تێیدا بنووسم، باسی ئەوەشی تێدا بکەم چۆن بەم حاڵە گەیشتم؟ داخۆ دوای ئەم هەموو ساڵە ژاراوییە دەتوانم بنووسم؟ چی لە نامەکەدا بڵێم ئەگەر لە کاتی نووسیندا بای شێتییەکەم هەڵی کرد؟

توانیم کاغەزێک بەچنگ بهێنم، دوای ماوەیەک (کورت نەبوو) پێنووسێکی

ڕەساسم بەدرێژی پەنجە تووتە دەستکەوت، ئاوەزم نەشئە گرتبووی، بیرم هاتەوە بەسەدان لاپەڕم نووسیوە و من دانەری کتێبی (فۆتۆگرافیای فەرمانڕەوای نموونەیی) و (لە بێدەنگییەوە بۆ دەنگ)م، قایلکردنی کوێخا بەڕاستیی پرسەکەم کارێکی هێند زەحمەت نییە، پێویستە پەلە بکەم لە نووسین بۆی بەر لەوەی هۆش لە کەللەسەرمدا نەمێنێت، پێم گوت:

– ئەزبەنی ئازیزم، ئەی کوێخای بەڕێز و وەجاخزادەی گەڕەکەکەمان، من، ڕەنگە بڕوا بەو ڕۆژە نەکەیت، ئەمین هاشم بەیتارم، نیوەم ئاقڵە و نیوەکەی تریشم... شێتە، تۆ هەر لە یەکەمین جاردا منت بیر هاتەوە کاتێک لەسەر سەکۆی بەردەرگەکەت بینیتم، منیان خستە زیندان و گرتووخانەکانەوە، دواتر فڕێیان دامە نەخۆشخانەی شەماعیەوە، لەوێش لە هۆبەی سێ زۆریان ئازار دام، گەورەم ئەوی لەوێ ڕووی دا پێویستی بەقسەیێلێکە درێژە دەکێشێت، پێویستم پێتە، خوا پایەدارت بکات، بەڵکو لەوی تێیدام ڕزگارم بکەیت.

نامەکەم هەڵگرت و لە درزی ئەو دەرگەیەی نیشانەی (ئێکس)ی پێوەیە ئاودیوم کرد، هەستم بەئاسوودەیی کرد، کە توانیومە شتێکی گرینگ و ماقووڵ بنووسم، هەڵبەت کوێخا هەر شتێک دەکات بۆ ئەوەی لە چنگی شێتی و برسیەتی و فەرامۆشیم ڕزگار بکات.

لە نیوەی شەودا خۆم لە کونجێکدا گرمۆڵە دەکەم، بیر لەو زستانە دەکەمەوە هێرشی بۆ سەر جەستەم سووک بکاتەوە، داخۆ ئەو دەمی کوێخای گەڕەک نامەکە دەخوێنێتەوە چی دەکات؟

من زۆرم پێویست بەچارەسەری بەردەوامە، تاکو لەو کاژێرانەی شێتی دەمگرێ و چەند کـــاژێرێکیش ئاوەز، ڕزگـــارم بکات، هەرچەندە من بەتێپەڕبوونی کات وا هەست دەکەم کاتی ڕابوونم لە جاران زیاتر درێژ بووەتەوە، لێ شێوە و جل و پێڵاوە دڕاوەکانم بیرۆکەیەک لەبارەی منەوە دەدەن، ئەویش ئەوەیە من کەسێکی نەویستراوم، دەبێ ئێستا نامەکەم بخوێنێتەوە؟ ڕەنگە نووکە گەڕابێتەوە ماڵ و کاغەزەکەی بینیبێت، کە لە درزی دەرگەکەوە ئاودیوم کرد، دوور نییە بیری لەوە کردبێتەوە بمبینێ و بەدووریشی

نازانم سۆراخی کردبم، کێ دەزانێت؟ لێ بەڕاستی دەترسم جارێکی تر سەری لێ بدەمەوە، ئەی چۆن ئەگەر ویستی یارمەتیم بدات، یان قسانم لەگەڵدا بکات، لەو دەمی سام دای گرتووم لەوەی نەکو لە بەرابەریدا شێتییەکەم بمگرێتەوە.

ئەو دوا ئومێدی ڕزگاربوونمە خۆمم پێوە گرتبێت، خۆ ئەگەر لەدەستم دا ئەوا ئەستەمە کڵۆڵ و نەساغێکی وەکو من لەوە زیاتر لە پانتایی دەریادا بمێنێت، چەند جارێک ناوی خۆم دووبارە و چەند بارە گوتەوە، ئەو زایەڵەیەی لە ناو مێشکمدا دەمبیست یاریدەی دەدام خۆم لە کەوتنە ناو قاووقیژی شێتی بپارێزم:

- من ئەمین هاشم بەیتارم، ناوم ئەمینە، ناوی باوکیشم هاشمە، باپیریشم بەیتارە، من دانەری چەندین کتێبم و ئەمینداری پێشووی حزبی شیوعیم.. ناوم ئەمینە، ئەمین، ئەمین.

دیوارەکان چاویان لە من بریبوو، بەدووریشی نازانم پێم پێ بکەنن.

## سەفییە

لە ساتێکی نەگبەتباردا پەرکەم چنگی لێم توند کرد و، بێ ئەوەی بتوانم لێی دەرباز بم ملی بادام، دەڵێی دەماری پێنجەم کاری خۆی کردووە، بەوەی ئیتر دەستی پاراستنی لێم هەڵگرتووە، بەشێوەیەک فییەکە وەکو ئەسپێکی سەرکەش سواری ملم بوو و توند بایدا، هەموو ئەو دە ساڵەی لە ناو شێتەکاندا بەسەرم بردبوو، ئاوم دەکرد بەسەر گڕی ئاگری بێ ئامانی شێتخانەدا، کە هارئاسا هەڵمەتی بۆیان دەبرد، ئەو شێتانە مرۆڤی جۆراوجۆر بوون، زۆریان سەرباز و نیوە مرۆڤ بوون، دۆڕاندن لە بەرەی شەڕەکاندا بەرەو نەخۆشخانە لوولی دابوون. دە ساڵی ڕەبەق لەو کەش و هەوایەدا بووم، کەچی هۆش و بیرم بەویەڕی بێگەردی و هێزەوە خۆیان پاراستبوو، هەموو ئەو هۆش و بیرە لە بەردەستی عەفرادا بەبا چوو و عەفرا وەکو کەسێک قرشەی شکاوی بەر ڕەشەبا کۆ بکاتەوە، کەوتە کۆکردنەوەی پارچە پرشوبڵاوەکانم.

لە دەستێکی قەبە، کە لاقی ڕاستی گرتبووم وەئاگا هاتم، دەستێکی ترساویش لاقی چەپەمی گرتبوو، هەرچی عەفرا بوو بەگشت مێیینەیی و ئەسرینیەوە سەری گرتبووم..

وابزانم لە بیرێکی قووڵی دوور لە جەستەمدا چاوم چووە خەو، لەوێ ئەندامەکانی لەشی مرۆڤم بینی تیپی تۆپی پێ گەمەیان پێ دەکەن، سەر و قنگ ئاوەژوو کراونەتەوە، ئەمیان ڕووە و تۆڕە کراوەکان تێی هەڵدەدات، ئەوی تریش خۆی ئامادە دەکات تاکو بەهێزتر لێی بدات، کەچی ناگاتە گۆڵەکە، مەگەر بەشەقی سێیەم یاخۆ چوارەم، سەرێک بەو یاریزانە توندوتیژە دەخەنێتەوە، کە هەڵەی کرد، پاشان دوای شەقی یاریزانێکی تر پارچە پارچە

دەبێت، شـای ئاژاوەگـێـڕان، لەو دەمی سـەر و پاشـووەکـانی لە سـەبەتـەیەکی گـەورەدا کـۆ دەکـردنـەوە خـۆشـیی بەسـەرکـەوتـندا دەهاتەوە، دواتـر مـیـدالی پاڵەوانێتی لەسەر ناوکی دادەنێت، بەخۆشـییەکەوە بـەنێوان یاریزانەکاندا تێ دەپەڕێت و ئەوانیش لە ترسـی زۆرداریییەکەی چەپڵـەیان لێ دەدا، وا دیارە هەر یەکێک لەوان ئامادەیی تێدایە (خـۆی) ببێتـە سـەری داهاتووی ناو یاریگەکە، یاخۆ ئەو قوونەی تێی هەڵدەدرێت تا دەبێتە دوو لەتەوە، بیرێکی قووڵی دوور لە دوامین چاڵدا بەئاگا هاتمـەوە بەر لەوەی عـەفـرا و دایک و باوکی ببـینم، کـە چاوەڕێی دەرچوونمیـان لەو یاریگەیە دەکـرد، کـە دەیان سـەر و قـوونـی تێـدا پارچە پارچە بووبوون، لە پێناوی مـیـدالیـایەکی بریقـەدار لە ملی پاڵەوانـێکی گومان لێکراویان کردەوە.

– چی بووە عەفرا؟

دایکی گوتی:

– هیچ نییە کیژی من، هیچ نییە، سوپاس بۆ خوا تۆ باشیت.

کـەچی خـەرەندە قووڵەکە هەر لە مـێشکمـدایە، ئەو هاوارەشی لە سـینگمـدا گـڕی گرت لـە یادمە وەک ئەوەی وتبـێتم (بەسـە، بەرازینە تێـر نابن) دوای ئەوە چی بەسـەر جـەسـتـەمـدا هات؟ عـەفـرا وەک ئەوەی لە بڕیارەکـەی بووبێـتـەوە، گوتی:

– دەبێت لێرە بمێنیتەوە، لەگەڵ ئێمە، تاکو ئەوی بۆ تۆ باشە بۆتی بکەین، بیرۆکـەی سـەفـەرکـردنەکـەت بۆ کـاتێکی نزیک هەڵدەگرین، مـەگـەر ئازیزم لە گوزەرانکردن لەگەڵمدا وەڕس بووبیت.

ئەو کات زانیم شتێکی خراپم بەسەردا هاتووە، حەزی عەفرایش بۆ مانەوەم ئارەزوویەکە بۆ پاراستنی ئەوەی ماومە.

بۆ شـەوی دووەم، کـە لە مـاڵی عـەفـرادا بووم، لە ڕێی ڕادیـۆوە گـوێمـان لە هەواڵی وڵات دەگـرت، کـارەبا بڕابـوو و خـەڵکەکـەش لە دۆخی خـۆشـیـیـەکی ترسـاودا بوون، عـەفـرا لێی پرسـیـم ئاخۆ دوای ڕووخـانی ڕێژیم ئومـێدی چی دەکەم:

- هیچ، هەر ئومێدێک دوای ئەوە شایان بەوە نییە تەنانەت بیریشی لێ بکەینەوە.. مۆتەکەکە هەپروون بەهەپروون بوو و قەڵا سەختەکەش بێ دەروازەیە.. کەس بڕوا ناکات ئەمە ڕوو دەدات.

باسی ئەوەم بۆ کرد چۆن هۆبەکانی شەماعیەیان کرد بەدۆزەخی سەر ڕووی زەمین، لەبارەی ئەمین هاشم بەیتارەوە، کە ناچاریان کرد لاسایی زەڕینی کەر بکاتەوە و چۆن جارێکیان لە بەزەیی پێدا هاتنەوەمدا خەریک بوو بیکوژم، بەڵام ترس لەوان نەیهێشت هێڵە سوورەکان ببەزێنم، لێم پرسی ئاخۆ ناوی ئەم کابرایەی بیستووە؟ کەچی گوتی:

- سەفییە، دڵگران مەبە لەوی پێتی دەڵێم، مێردەکەم لە دەزگەی هەواڵگری کار دەکات، پێش ڕۆیشتنەکەی بۆ سلێمانی پێی گوتم بەرەو مەرگ دەچێت، وای بۆ دەچم مردبێت، یاخۆ خۆی دابێتە دەستەوە و دانی بەوەدا نابێت، کە بۆی چووە، پیاوەکەم عەمار موزهر شێخە، دوور و نزیک وایان ناسیوە، کە لە کوشتن و ئەشکەنجەداندا سەرەڕمی هەواڵگرییە، کەچی تەواو بەپێچەوانەوەیە، ئەو بوێریی سەربڕینی مریشکێکی نییە، بەڵکو ئەوان خۆیان سیفەتی مەرگ و توندوتیژییان داوەتە پاڵ، تاکو ئەو هەستەی لەلا بڕوێنن هەرگیز قوتاربوونی لە چنگیان نییە، مادامەکی سەرجەم میللەت ئەو پیاوکوژە هارەی تێدا دەبیننەوە، کە بەسەدان زیندانیی کوشتووە.

هەستم بەزەوییەکە کرد لە ژێرمدا نامێنێت، ئەوی دەمبیست نەدەچووە مێشکمەوە، تەواوی خەڵک دەزگای کوشتن و سەرکوتکردن و ئەشکەنجەدانن، ئەی کوانێ بێتاوانەکان؟ چییان لێ هات؟ نیشتمان بووەتە بووکەشووشەیەک دەجووڵێتەوە و سکی دەلەرزێنێت، تاکو پێی پێ بکەنین، ئارامت بێ، هێشتا بەشێکی دنیا باشی تێدا ماوە، لە کوێ؟ لە چ بەشێکی عەفرا؟ لە باکور، یاخۆ لە باشوور؟ لە ڕۆژهەڵات، یاخۆ لە شێتی؟ بەدرەوشتی و گوناه و هەڵە قیری شەقامەکان و بەردی بناغەی سەرپاکی ئەو شتانەن، کە لە ژیانماندا تێپەڕبوون، من پرسیاری ئەمین هاشم بەیتارم لێ کرد، کەچی باسی پیاوێکی بۆ کردم، کە مێردیەتی، داخۆ خۆی لێ نەبان کرد، نایەوێت لەوەوە ببیستم؟

پاشـان، دوای بێدەنگییەکی سەیر، کە لە نێوان من و ئەودا قەلەڕەش ئاسا نیشتەوە، گوێم لێ بوو دەیگوت:

– ئەمـین هاشم بـەیتـار، باشـتـرین دۆسـتی مـاڵەکـەمـان بوو، لە ڕێگەی داپیـرەمـانەوە سـەرجـەلەمـان دەگـاتـەوە یەک، لە ڕۆژانی بەرەی نیـشـتـمـانیـدا بەڕۆژی نیـوەڕۆ، بێ ئەوەی لە کـەس بتـرسـێت سـەردانی دەکـردین، ئەمـەش یەکەم هۆی گومـان لێکردنی حکوومـەت بوو لە بەرابەر مێردەکەمدا .. وا دیارە ئێـمـەش دوو جـار نرخـەکـەیمان دایەوە و زیـانەکـەشی سێ قـات، عـەمـاریش بەدەردی ئەمین هاشم بەیتـار چوو و ونیان کرد، منیش لە دۆخێکی پڕ لە ترس لەوەی لە هەر سـاتێکدا ڕوو دەدات، مـامـەوە، تاکو ئەو ڕووخـانە شـەرمـهێنەرە هات و ژیان بەبەر جەستەمدا کرایەوە.

پاشان وەکو شتێکی بیر کەوتبێتەوە، گوتی:

– سەفییە، وێڕای ئەمەش زیـانەکانمان لە چاو ئەو ماڵوێرانییانەی دەیانزانم هیچ مـانایەکیـان نییە، بەڕووی عەمـاردا دەمـقـیـژاند با بێدەنگ بێت و بەزەیی پێمدا بێتەوە لە بـاسکردنی ئەوی دەیکەن، لە کەوڵکردن و سەربڕین و کوشتن لە کـوشـتـارگـەی حکوومـەتدا، پێـڕی ڕابـواردن و شـەڕ و کـێـشـە، کـە لە سووکایەتیکردن بەخەڵکدا سڵیان نەدەکردەوە.

گوێمـان لە لێـدانی بەئاسـتـەمی دەرگـەی ژووری عـەفرا بوو، دەنگی دایکی هات دەیگوت:

– کچینە کاتژمێر سێیە، پێویستتان بەکەمێک خواردن نییە؟

لە سێی شەودا چامان لەگەڵ پەنیر و ناندا خواردەوە، هەر یەکەشمان بیری لەو کوشتـارگـەیە دەکردەوە، کە سی و پێنج سـاڵ بەردەوام بوو، بێ ئەوەی بۆ تاقە کاژێرێکیش لە کار بوەستێت.

***

دوای دە سـاڵ لە جەور و سـتەم و غەم و دڵڕەقی و شێواندنی ڕوح و جـەستە تووشی نەخـۆشیی پەرکەم هاتم، لەوێ لە شەمـاعیە تەندروستیم خراپ نەبوو،

هەرچەندە لە ژێر ڕەشماڵی ترسدا دەژیام و هیچ شتێک دای نەدەپۆشیم، من کەنیزەکێکی بازاڕی کۆیلەفرۆشان بووم، لەسەر گۆشتەکەم نۆبەیان دەگرت، پاشان دەیانتفاندەوە بەسەر ئەو ئافرەتەدا، کە گشت شتێکی خۆی لەدەست دا، تەنانەت پاکیزەییەکەشی، ئەویش هیچ شتێکی بەدەستەوە نەدەما، تەنیا خەونێکی دوور جار جار بەهەڵە ڕێی دەکەوێتە ئەوێ (کەی لە بۆنی بەرازان ڕزگارمان دەبێت؟ کەنگێ ڕووناکی لە دەرەوەی دیوارەکانی ئەم شوێنە ترسناکەوە دەبینین؟).. وێرای ئەوەی جیهانی شێتیم جێ هێشتووە، وابزانم لە پەتیارەیی نزیک دەبمەوە، چ هاوکێشەیەکی سەیر و سەمەرەیە، من لە نێوان ئەو هەموو شێتەدا ئاوەزی خۆم پاراست، پاشان دوای دەرچوونم لە گەورەترین بەڵا، کە تێیدا ژیام، شتێک لە شێوەی شێتی دێت و دەمگرێتە خۆ؟

وەکو سەرخۆشان بەلادا دێم و خەریکە لە بستێک ئاودا نقوم دەبم، تاقە بەزەییەک ئاسمان پێی بەخشیبم عەفرا بوو، ئەو شنەیەی لە تاریکترین ساتەکانی ژیانمدا بەسەر هەنیەمدا هەڵی کرد، هێشتا لە ماڵە کۆنەکەیدام، باسی ئەوەم بۆ دەکات چی بەسەر مێردەکەیدا هاتووە، کە هێشتانەکینێ لە سلێمانییە، دوای لەوتاندنی ناوی ئیتر ناتوانێت بگەڕێتەوە بەغدا، ناکرێت قەناعەت بەخەڵک بهێنرێت، کە عەمار موزهر شێخ ئەو کەڵبە هارە نییە، کە ناوی لە چڵپاوێکی بێبندا هەڵکێشراوە.

وا دیارە عەفرا بۆ لای دەچێت، چونکە چاری لەمە زیاتری نییە، مادامەکی دوای ئەم هەموو ساڵە ناوی بەلەکەداری پێچراوە، عەفرا سەبارەت بەپیاوێک دەدوێت خـــــۆشی دەوێت، چارەڕەشی بەدوویەوە بوو و تووڕی هەڵدایە شوێنێکەوە دوور لە زێدی ئەم، لێ ئەو بۆ ئەوەی ئەوی ماوە بیپارێزێت، بەخۆی ئەم بڕیارەی دا، عەفرا هیچ شتێکی پێ نەگوتم، تەنیا ئەوەی پێ گوتم، کە لە یادەوەریی دەکرد، لە خوێندنەوەی کاغەزەکانییەوە بۆم دەرکەوت عەمار موزهر شێخی مێردی هێشتا ماوە، بەڵکو بەحەشارگە و شوێنەکەشی دەزانێت ئەگەر بیەوێت بیبینێت، لێ ئەو ترسەی لە دەمارەکانیدا ژیا و لە داڵانەکانی پەراسوو و ڕێڕەوی خوێنەکەیدا گەشەی دەکرد، لە دۆخێکی پڕ لە سامی وادا

هێشتییەوە جیاوازیی لە نێوان دۆست و دوژمندا نەدەکرد.. ترس و تۆقینی عێراقی لە ترس و تۆقینی هیچ شوێنێکی سەر ڕووی زەوی ناکات.

عەفرا کلیلی ئەپارتمانەکەی دامێ:

- ئەگەر بوونت لێرەدا بەگونجاو نازانیت، ئەمە کلیلێکی ترە.

لە ژێر گسکێکدا وەکو پیسی بەرەو دەرێ ڕام بماڵێت شەرم و فەدی دای گرتبووم، هەینێ پێم گوت:

- من لە ماڵی خۆمدام عەفرا، بەدرێژاییی تەمەنم ماڵی خۆم نەبووە، وا دیارە خێزانەکەم لە کەسانی تر ناچن، برایەکی نەخۆش و باوکێک دەرگەی دۆزەخم لێ دەکاتەوە و دایکێک هەواڵی کچەکەی ناپرسێت..

عەفرا بەگوێیدا چرپاندم:

- گوێ بگرە سەفییە، من دڵنیام ئاتاجی شتێک لە ئازادییت، بەڕاستی ئەپارتمانەکەی ساڵحییەم پێویستی بەدەست پێداهێنانێکی ئافرەتانە هەیە، خۆ ئەگەر ئەوێشت بەدڵ نەبوو دەتوانیت بگەڕێیتەوە ئێرە.

کلیلەکە و ژمارەی شەقام و باڵەخانەکەی پێدام و هەندێک پارەی خستە مشتمەوە، نەیهێشت ناڕەزایی دەربڕم، دەیگوت چڵکی دەستە، گرینگ ئەوەیە وا لە پارە بکەین لە خزمەتماندا بێت، تاکو ژیان ڕێگەی ڕاستی خۆی بدۆزێتەوە.

ئەپارتمانەکەی ساڵحییە دامیە دەستی دەروون ئاسوودەیییەوە، بەلای منەوە لە خۆشترین خەون، کە لە ژیانمدا ئاواتم بۆ خواستبێت خۆشترە، دیواری گەرماوەکەی شین و بانیۆکەشی دوو جاران لە من گەورەترە، جامەکانی دەسڕمەوە و زەوییەکەی خاوێن دەکەمەوە و لە تەنیشت تەلەفزیۆنە قەبارە گەورەکەوە دەنووم.. لە پەردەکانەوە لە شەقامەکەم ڕوانی، نامەوێت کەس لەم بەهەشتە ڕازاوەیەدا ببینێت، نەکو ئەو پەرجووەی بەدەستم هێناوە لەدەست بدەم.

تەلەفۆن، کتێبخانەیەک نزیکەی سەد کتێبی تێدایە، تەباخێکی چوار چاو،

یەخچاڵێک بەدەم وێنەکەی مەکی ماوسەوە پێ دەکەنێت، چلچرایەکی گەورە، دوو ژوور و هۆڵێک، سپلیت، چەند چەمەدانێک لە ژێر چارپایەکەدان، دەرمانخانەیەکی بچووک بەتەنیشت دەرگەکەوە، وێنەی عەفرا و مێردەکەی لە شەوی زەماوەندیاندا، هەردووکیان بزە گرتوونی، سەرم لەبەر بۆرییەکە شوشت و هەستم کرد ئێستاکێ دەست بەژیان دەکەم.

## عەمار موزهر شێخ

بەڵاکەی من لەوەدایە لە هی کەس ناکات، بەخۆتان دەزانن و شارەزان من پیاوی هەواڵگریم، پیاوی هەواڵگریش لە وڵاتێکی وەکو عێراقدا واتای پیاوکوژ و تاوانکار دەگەیەنێت، کە هیچ سۆز و بەزەییەکی تێدا نییە و پێڵووەکانی ناپرووکێنێت، و لە هیچ ناپرینگێتەوە هەینێ خەڵکی دەکاتە دوو لەتەوە، یاخۆ لە بەرمیلی گازدا دەیانسووتێنێت و چێژ لە دیمەنی ئەو هەڵمە دەبینێت، کە لێوەیان هەڵدەستێت، چون لە ناخی بەردەوە هەڵقوڵابێت و بەکۆرپەیی مەمکی ژنێکی نەمژیبێت، کە دایکییەتی و لە ژیانیدا نەخەنیبێتەوە، تەنیا لەو کاتەدا نەبێت، کە جەستەی ئەشکەنجەدراوان بەر قامچی دەدات و لێی دەپاڕێتەوە، بەڵکو کاژێرێک دوان لەسەری سووکی بکات، خۆ ئەگەر گوتم ببوورە (من کەسم نەکوشتووە و سەرنەبریوە و ئازاری کەسم نەداوە) ئەوا خەڵکی پێم پێ دەکەنن.. هەڵبەت بەر لەوەی پێ بکەنن من کارەکەم لەدەست داوە، پێش ئەوەیشی ئیشەکەم لەدەست بدەم خێزانەکەم دەدۆڕێنم، دوای ئەوەی بەزەویمدا دەدەن و بزمارەکانیان لە جەستەم دادەکوتن و پوازی ئاگر لە نێوان پەراسووەکانمدا دەکوتن، تاکو ئاوەز و مرۆڤایەتیم بسڕنەوە، وەک چۆن بەهاوپیشەکانی بەر لە منیان کرد، حاتەم نەجاڕ بەبەرچاوی خۆیەوە دەستدرێژییان کردە سەر خوشکەکەی، چونکە ڕەتی کردەوە قۆڵی مامۆستای قۆناغی سەرەتاییەکەی بشکێنێت، پێی گوتن:

– ئەوی پیتێکی فێرکردووم دەبمە کۆیلەی، ئیتر هەر لەو دەمەوە فێری کۆیلایەتییان کرد، هەر لە پیسترین جۆرێن و سووکایەتی پێکردنەوە، تاکو نینۆک هەڵکێشان و هەڵواسین بەپانکەوە، هەروەها عەباس حلو، هێند قامچییان لێ دا تا گیانی لەدەست دا، شتێکی وا یشی نەکردبوو ئەوەندە

نەبێت لە دەمی دەرچوو بوو، وتبووی:

- وا دیارە ئێمە زیاد لە پێویست ئەشکەنجەی تۆمەتباران دەدەین.

هاتنە ناوەوەم بۆ ئەم ماڵی هەواڵگرییە لەبەر گرینگی، یاخۆ ڕاکردن بەدوای پارە و شکۆمەندی و دەسەڵاتدا نەبوو، بەڵکو ناچاری ئاگر هەڵبژاردنیان کردم، پاش ئەوەی دۆزەخ دوا شت بوو پێشنیازیان بۆ کردم:

- ئێمە پێویستمان پێتە، ئەوی ڕەتمان بکاتەوە مانای وایە لەگەڵماندا تەبا نییە، خاترجەم بە، لەوەی بڕوات پێیەتی زیاتر ناکەیت، دەزگاکەمان ئەوە نییە خەڵک تێی گەییون، دەزگاکەمان بۆ پاراستنی وڵاتە لە خراپەکاریی چاوچنۆکان، کە لەودیو سنوورەوە چاویان تێ بڕیوین، ئێمەش تەنیا زیرەک و شەرافەتمەندەکان بۆ پاراستنی ئەم نیشتمانە هەڵدەبژێرین.

ساڵێک بەشەو و ڕۆژیەوە لێم گەڕان، لەو ماوەیەدا شتێکی وام نەکرد شایانی باسکردن بێت، ئەوەندە نەبێت لەگەڵیاندا گەشتم کرد بۆ پراگ و بەرلین و مۆسکۆ، لە ساڵی دووەمیشدا بۆ شت کڕین بردمیان بۆ پاریس و بۆدابێست و دیسانەوە پراگ (دەبوو لە هەر گەشتێکدا سێ ڕۆژ لە پراگ ببەینە سەر، کە زۆرم حەز لێ دەکرد و هەر لەوێش چارەی نەخۆشییەکەمیان کرد، کە بۆ جارێکیش سکاڵام لە دەستی نەکرد)..

وای لێ هات گەشتکردن خۆشییەکی گەورە بوو، بەردەوام بیرم لە ساتەکانی و ئافرەت و ماڵەسۆزانی و سووڕخانە و شەقام و باڕ و کیژە شۆخ و شەنگەکانی دەکردەوە، هەروەها ئەو پارە و دیارییانەی لێوەی دەستم دەکەوتن وایان لێ کردم وەکو پاشا بژیم.

دوای ڕاهاتنم لەسەر سەفەر و خووگرتنم بەپارە کۆکردنەوە و ئافرەت، کاری تایبەتم دەستی پێ کرد، نازانم بۆ لە ناو ئەو هەمووەدا لە هەواڵگری، لێکۆڵینەوە لەگەڵ عەرەبەکاندا بەتایبەتیش خوێندکارە فەلەستینییەکان بەمن سپێررا، هەرچەندە ئەمڕۆ وای دەبینم ئەهوەنترە لە گۆشەکانی ئەشکەنجەدان و مل شکاندن، شتێکی وا لای خوێندکارانی زانکۆ نەبوو شایانی ئەوەبێت

خـۆتیـان پێـوه خـەریک بکەیت، وەکـو لێکۆڵینەوه لەگـەڵ پیـاوانی ئاینی و ئەندامانی حزبی دەعوه و پاشماوەی ئەو دوژمنـانەی تا ئێستا وا دەزانن ڕۆژ له ڕۆژهـەڵاتەوه هـەڵدێ و زەوییش بەبڕوا و کـەیفی دڵی ئەوان دەخـوولێتـەوه..
من وەکـو بێتـاوانێک قسـانم لەگـەڵ تۆمـەتبـاردا دەکـرد، تاکـو تـاوانەکـەی بەدەردەکەوت، پاشان دوای ساڵێک له لێکۆڵینەوه بۆم دەرکەوت ئەوی دەیڵێم و دەینووسـم تەنیـا قسـەی له ئەرشـیـف پارێزراوه و کـەس گـرینگی پێ نادات.
ئەوەشـم بۆ دەرکـەوت هـێشـتـا من له ژێـر تاقـیکردنەوەدام، چونکه لەلایـەنی خـێزانـییـەوه سـەر بەسـەرجـەلەی سـەرۆک نیـم، ئەمـەش مـانای ئەوەیه لەو شـوێنەدا دەمـێنمـەوه، کە شـوێنی من نییـه و له پلەیەکیشدا دەبم لەگەڵ مندا ناگونجـێت، تا ئەو کاتەی بێ هـیچ گومـان و دوودڵیـیـەک دڵسۆزیی خـۆمـیـان نیـشـان دەدەم، هەروەها ئەوەشـیـان فـێـر کـردم، کـە تاوانبـار پێـشـوەخت (گوناهبـاره)، تاکو بێتـاوانییـەکەی دەردەکەوێت، نەک بەپێـچـەوانەوه، کە من باوەڕم پێ بوو.

***

دوای خـواسـتـنی عـەفـرا خـەلیـفه قـازی، ژیانم تا ڕادەیەک گۆڕا، ڕاسـتـیی کـارەکەی خـۆمم پێ نەگوت، نەکو خۆی، یاخـۆ کەسـوکارەکـەی ڕازی نەبن، ئەو دڵنـەرمـتـرین ئـافـرەت بوو بینیـبـێـتم، له سـاتێلی ڕاڕایی و ترسـدا ئاواتم دەخواست نەمـخواستبایا، چونکه ئەم جۆره ئافرەتانه لەبەر ناسکی و هەست بەرزییـان لەوەی دەیبیـسـتن و دەیبینن، خـەریکه لـەسـەر ڕووی زەوی قـڕیان تێ دەکەوێت، بۆیه دوای ماوەیەکی کەم بۆم ئاشکرا کرد، کە له دەزگای هـەواڵگری ئیش دەکەم، شـەوێکی تێکچڕژاو بوو، عەفرا تابەیانی خەو نەچووه چاوی.
مـێـردمنداڵێکی بیـست سـاڵانیـان بۆ هێنام، تا ئێـسـتـا ناوەکـەیم له بیـره (محـەمەد جـەمیل سوێرکی) له خێوەتگەی عێنل حیلوەی خـواروی لبنان بوو، مـەجـیـد سـەعـدوون (گـەورەترین سـەگی ڕاو بوو له ئـەتککردنی ئـافـرەتان و دەرفەت قۆزینەوەدا) پێوەندیی پێوه کردم و گوتی:
- دەمـانـەوێت بزانیت، ئەم بەرازه تـاچەند دەسـتی له سـیـخـوڕیکردن

بەسەرمانەوە هەیە، دانپێدانانێکی نووسراو و بیستراومان دەوێت، ئەوی بەلامانەوە گرینگە، تا ماوەیەکی زۆر لاتان بمێنێتەوە.

لە قسەکانی مەجید سەعدوونەوە بۆنی ئافرەتم کرد، دەیویست تا ماوەیەکی درێژخایەن لای بمێنێتەوە، وام لێ هات لە هەر جارێکدا گوێم لە تێوەگلانی ئەم و ئەو بەتۆمەتی سیخوڕیکردن، یاخۆ بەچاوی بەد ڕوانینە قەلاکانی حزبی دەسەلاتدار دەبوو، هەستکردن بەترس لە عەفرای ژنم زیادی دەکرد، ڕاست وادەرچوو، هەر لە یەکەمین پرسیارم لە جەمیل سوێرکی تێگەیشتم ژنە (تەمەن بیست ساڵ)ـەکەیان بۆ داوەتی کەمتیاران بردووە.

ئەمجاریان، بەر لەوەی گوێم لە حەز و ئارەزووی بەرپرسەکەم بێت، تا لە گەشتی پاریس و ڕۆما و بوخاریست لەگەڵیدا بم، دڵنیا بووم جگە لە (گەواد)ێکی هەواڵگری زیاتر هیچی تر نیم، تۆمەتبارێک لای خۆم بهێڵمەوە، کە هیچ تاوانێکی نییە ئەوە نەبێت ژنەکەی گەنجە و تابلێی شۆخ و شەنگ و بالابەرزە، وێڕای ئەوەش چووم بۆ پاریس و بوخاریست و ڕۆما، ترسەکەمم لە چەمەدانی جلەکاندا هەڵگرتبوو و لە هەر شوێنێکیش ڕامان ببواردایا بزە لە لێوم نەدەبڕا، نەکو بەرپرسەکەم بزانێت (من لەگەڵیاندا نیم و باوەڕیشم پێیان نەماوە).

بەئازار و داخەوە دەخەنیمەوە، ئەو ئاوێنانەی خۆمم تێیاندا دەبینییەوە، گاڵتەیان پێ دەکردم و دەیان گوت:

– عەمار شێخ، ڕۆڵی گەوادت لێ نایەت.

## محەمەد جەمیل سوێرکی

لە یەکی ئابی ١٩٨٠دا تەمەنم نزیکەی بیست ساڵان بوو، ساڵێک بەسەر وەرگرتنی بڕوانامەی دواناوەندیمدا تێ پەڕیبوو، لە سۆنگەی بێ پارەییمانەوە نەمتوانی لە هیچ یەکێک لە زانکۆ عەرەبییە دراوسێکاندا بخوێنم، بۆیە چووم بۆ خوارووی لبنان، تاکو لەوێ کاری ئازاد بکەم، بەڵکو هەندێک لە پێداویستییەکانی خێزانەکەمان دابین بکەم، لە حوزەیرانی ١٩٨٢دا (سامیە)ی شۆخ و شەنگی ئامۆزای خۆم خواست، کە دوو ساڵان لە من گەورەتر بوو و ئیشی بەرگدووریی دەکرد، هەر بەڕاستی لەوپەڕی جوانی و نازداریدا بوو.

لە یەکێک لە سەردانەکانمدا بۆ بەیرووت، سەد بریا نەچووومایا، کابرایەکم لە خێزانی (بەشور) ناسی، لە سەرکردایەتیی حزبی بەعسی لبنانی بوو، کە باڵێکی سەر بەبەعسی عێراق بوو، سکاڵای دەردی خۆم بۆ کرد، لەگەڵ حەزکردنم بەتەواوکردنی خوێندنی زانکۆ، دوای چەند ڕۆژێک پێوەندیی پێوە کردم و لە بیستی تەمووزی ١٩٨٣دا چووم بۆ بینینی لە بەیرووت، لەوێ ڕووبەڕووی هەواڵێکی دڵخۆشکەر بوومەوە، توومەز توانیویەتی ناوم لە بەشی مێژوو لە زانکۆی بەغدا تۆمار بکات، وەکو پێی گوتم دەبێت ئەوپەڕەکەی بۆ بەر لە سەرەتای ئابی ١٩٨٣ لەوێ بم، تاکو لەگەڵ کردنەوەی زانکۆدا پێی ڕابگەم، ئەوەشی پێ گوتم، دەتوانم ژنەکەشم لەگەڵ خۆمدا ببەم، لەوێ لە شاری زانکۆیی ژوورێکمان دەدەنێ، دواتر پێوەندیی بەبەرپرسی حزبیی ئەوێوە لە بەغدا دەکەم، تاکو کارێک بۆ ژنەکەم لە هەمان زانکۆدا بدۆزێتەوە، ئیتر بەوە ئەپارتمانێکی باش بەکرێ دەگرین و شاری زانکۆیی جێ دەهێڵین، چەندە بەتاسەوە بووم بەغدای پایتەخت ببینم، کە لە زۆرێک لە کتێبەکاندا

لەسەریم خوێندبووەوە.

لە ئێوارەیەکی قەشەنگدا گەیشتینە بەغدا، بۆ سبەی دەمودەست چووینە لای بەرپرسی حزب لە کۆلیجی ئادابی زانکۆی بەغدا، کە وا خۆی پێ ناساندین هاورێ (مەجید سەعدوون)ـە.. پاشان لەگەڵ لێخورە تایبەتەکەی خۆیدا ڕەوانەی شاری زانکۆیی کردین، لەوێ ژوورێکمان دەستکەوت، داوای کرد سبەی ژنەکەم بەتەنێ بێتەوە لای، تاکو کارێکی بۆ دابین بکات، کەچی کاتێک (سامیە) لەو چاوپێکەوتنە گەڕایەوە، تابڵێی لە ڕەفتار و قسە و دووبارەکردنەوەی حەزی ئەم سەعدوونە بۆ بەتەنیا هاتنی بۆ نووسینگەکەی بێزار بوو، بەبیانووی ئەوەی ئەو ئیشەی بەڵێنی پێ دراوە زیاد لە پێویستە بۆ ئێمە..

لە گەرمەی ئەم پێ ڕابواردنە منداڵانەییەدا وەرزی یەکەمی ساڵی ١٩٨٣ تەواو بوو و هێشتانەکینێ بەڵێنی ئەو کارەی درابوو بەژنەکەم بەجێ نەگەیەندرا، لە هەر سەردانێکیشدا مەجید سەعدوون سوێندی دەخوارد کارەکە زۆر نزیک بووەتەوە.

لە پشووی نیوەی ساڵی زانکۆدا، کە دوو هەفتەی دەخایاند، کابرای بەرپرس بەخۆی تەلەفۆنی کرد و گوتی:

- بانگهێشتتان دەکەم لەگەڵ خێزانەکەمدا پشووەکەمان لە هاوینەهەواری سەلاحەدین لە باکوری عێراقدا بەسەربەرین.

هەر بەڕاستی وای کرد، یەکێک لە ئۆتۆمۆبێلەکانی بەدووادا ناردین و بۆ ئەوێی بردین، ئەو بەخۆی لە چاوەڕوانیماندا بوو، لەگەڵ ژنەکەمدا گەیاندمانییە ئەپارتمانێکی ڕازاوە، سیمای خۆشی و کەشخەیی و تایبەتمەندیی پێوە دیاربوو، بەشێوازێکی ڕێوییانە بەدەنگی نزمەوە گوتی:

- ئێستا پشوو بدەن، سەرلەئێواری خێزانەکەم بۆ یەکتر ناسین دێت، پاشان بۆ نانی شێوان پێکەوە دەچینە شوێنێکی جوانتر.

هەینێ لەو ئەپارتمانەدا جێی هێشتین گوایا لە هەشتی ئێوارەدا دێتەوە،

هەستم بەژانێک کرد بەسکمدا دێت، دوای ئەوە خەریکبوو برشێمەوە.. گشت شتێک لەم مەجید سەعدوونەی جار ناجارێک چاو دەبڕێتە جەستەی ژنەکەم مایەی ترسە، تا بڵێی بەسام و قێزەونە لەگەڵ زۆرێک لە ئێسکقورسی و بێ شەرمی.

***

لە هەشتی ڕێک مەجید سەعدوون بەتەنێ بۆ ئەپارتمانەکەمان هات، شتێک لە گۆڕێدایە، بەو وەڕسی و بەدی و بێ شەرمییەیەوە، سیمای گومان و دوودڵیی بێ پایانی پێوە دەبینرا، لەو دەمی چاوەدزیی ژنەکەمی دەکرد، گوتی: ژنەکەی دوای کاژێرێک دێت، ئێستاکێ بەکاروباری کتوپڕی حزبەوە سەرقاڵە.

پاشان چون داوای لێبووردن لەو گەمژەییەی خۆی بکات، گوتی:

– محەمەد جەمیل ئیشێکم پێت کەوتووە، هەندێک پەروەندی گرینگم لە نووسینگەکەم لە بەغدا لە بیر کردووە، من تۆی لێ بترازێت متمانەم بەکەس نییە بیانهێنێت، برۆ شۆفێرەکەم لەگەڵ خۆتدا ببە، پەروەندەکان لە بەرابەرت لە ژێر گلۆپەکەدا دەبینیت.

ئەنانی ئێوارە هەبوو، ئەیش ژنەکەی هات (لێ بەردەوام دەیگوت هەر دێت).. دەبوو بەو شەوە بەهاتن و چوون نزیکەی دە کاژێر ڕێگە ببڕم، ئەمە ئەگەر ڕێگە چۆڵ و بێ گرفت بێت، هەڵبەت نەمدەتوانی ڕەتی بکەمەوە، ئەمە ئەو خزمەتە بوو، کە هانی دەدا کار بۆ ژنەکەم دابین بکات، جگە لە ترسم لە دەسەڵات و ستەمکارییەکەی، پاشان دەیگوت (دوای ئەختێکی تر خێزانەکەم دێت)، ئەوی گرینگ بوو بەلای منەوە ئەوەبوو سامیە لەگەڵ ژنی ئەم هاوڕێیەدا ئاسوودە بێت، هەرچەندە قێزم لە خۆی و لە ڕەفتارە منداڵانەییەکانی کردەوە، کە لەگەڵ پایە و ناو و ناوبانگیدا نەدەگونجان.

چوون و هاتنەوەمان لە باکورەوە بۆ بەغدا، زۆر شەکەت و ماندووی کردین، نەخوازەلا لە کەمتر لە ڕۆژێکدا دووبارە بووەوە، هەینێ گەیشتمە نووسینگەکەی لە بەغدا، بینیم کلۆم کراوە، بەناچاری تا بەیانی چاوەڕێم کرد،

سکرتێرەکەی چەند پەروەندێکی لە جانتایەکی داخراوی بچووکدا دایە دەستم (لەو ساتەدا وام هەست کرد سکرتێرەکە پێم پێ دەکەنێت و بەسووکم دەزانێت)..

دوای بیست کاژێر گەڕامەوە هاوینەهەواری سەلاحەدین، واتا پاش ئەوەی بەمەزەندەی خۆم ژنەکەم نزیکەی شەوێکی لەگەڵ مەجید سەعدوون و خێزانەکەیدا بردووەتە سەر.. پەروەندەکانم دانە دەستی و بۆ ئەپارتمانەکەی خۆی ڕۆیشت، ئەوی بەلامەوە سەیر بوو ئەوەبوو ژنەکەم گوتی بەدرێژایی شەو بەتەنێ لەگەڵیدا بووە، هیچ شوێنەوارێکی ژنەکەی، یاخۆ کەسێکی تر لەو شوێنە دوور لە خەڵکە نەبووە، ویستی بەسێکس لەگەڵدا کردن قایلی بکات، جارێک بەهاندان و دیاری و کار، جارێکیش لە ژێر ڕێژنەی وشەی پڕ لە ئەوینی هەڕەشە ئامێزدا، بەتەواوی بۆی ڕوون نەکردمەوە داخۆ بەمەرامی خۆی گەیشتووە یا نا، ئەوی مایەی سەرسوڕمان بوو دوای ئەوە هات و داوای لێبووردنی کرد، کە خێزانەکەی بەکاری کتوپڕی حزبەوە سەرقاڵ بووە و بەمێشکی کەسیاندا نەهاتووە شتی وا ڕوو بدات، بۆیە دەبێت (هەر ئێستا) بگەڕێینەوە بەغدا، نەکو ژنە بەئاگاکەی تووڕە ببێت.

***

وەرزی دووەمی خوێندن دەستی پێ کرد، هێشتا لەگەڵ ژنەکەمدا لە هەمان ژووردابن، دوای هەفتەیەک لە دەوام بەرپرسی ئاسایشی کۆلێج پێی ڕاگەیاندم، کە من بۆ لێکۆڵینەوە داواکراوم، زانیارییەکان دەڵێن؛ من لەلایەن حزبی بەعسی سورییەوە (نێرراوم)، تاکو سیخوڕی لەسەر بەعس لە عێراقدا بکەم، بێگومان لەو دەمی پێکەنینم بەو تۆمەتە درێوە دەهات، ئارامم لەبەر بڕا و زارەترک بووم، چونکە واتای کوشتن، یاخۆ زیندانی هەتاهەتایی دەگەیاند، بەرپرسی ئاسایشی کۆلێج تا هێزی تێدا بوو شەپازلەیەکی خێواندمێ:

- بەکێ پێ دەکەنیت هەی نارەسەن؟

پاشان پاسەوانەکانی بردمیان بۆ لای سەرهەنگێک ناوی (جاسم مەعانی) بوو، لە هۆبەی ژمارە ١٢ی بەندیخانەی (ئەبوغرێب)، کە هەر کات ناویم

دەبیست مووچڕکە بەگیانمدا دەهات، پەروەندێکم بینی دەیان کاغەزی تێدا ئاخنرابوو، ناویشم لەسەری بەڕەنگی شین نووسرابوو (محەمەد جەمیل سوێرکی، بەڕەگەز فەڵەستینییە).. سەرهەنگ بەپێڵاوەوە شەقی تێ هەڵدەدام و دوای ئەوەی کەوتمە سەر زەوییەکە شیراندی بەسەرما:

– هەستە هەی فەڵەستینی، ئەی سیخوڕ، بەو خوایە ئەشکەنجەیەکت دەدەم ئەشکەنجەی دانپێدانان بێت، هەی سەگ.. هەستە هەی هیچوپووچ.. نەفرەت لە خۆت و لە گشت فەڵەستین.

لەوەی پێیان کردم هەستامەوە، بەدەم ژانێکەوە هاوارم دەکرد مەگەر خوا بیزانێت، ئەوی زیاتر ئازاری دام جوێنی بەنیشتمانەکەم و کەسوکار و ڕەچەڵەکم دەدا، ئینجا بەتێلا دەیکێشا بەپشتمدا و دەیگوت:

– فەڵەستینیی سیخوڕ، بەدڵنیاییەوە باوکت زەوییەکەی بەجوولەکە فرۆشتووە، سەگینە، زەوییەکانتان دەفرۆشن و پاشان بۆی دەگرین.

لەسەر فەرمانی ئەو پاسەوانەکەی بەدەست بەستراوی بردمی بۆ زیندانێکی تا بڵێی پیس و پۆخڵ، بەتوندی پاڵی پێوە نام، تا دەموچاوم بەر دیوارەکە کەوت، دوایی دەرگەکەی داخست و بۆ لای سەرهەنگ گەڕایەوە.

پتر لە چوار مانگ لە سووکایەتی پێکردنم بەسەر برد، بێ ئەوەی کەسێک پرسیارم لێ بکات، یاخۆ لە ڕاستیی گرتنەکەم بپرسێتەوە. کێشم هێند کەمی کردبوو وەک ئەوەی تووشی نەخۆشیی سیل هاتبم، ئازاری گەدە کوشتبوومی، تا هێزم تێدا بوو بەدەست ژانەوە هاوارم دەکرد، نە پزیشک هەبوو نە دەرمان، ماوە نا ماوەیەک جاسم مەعانی داوای دەکردم و لەو دەمی وەکو گورگی هار دەخەنییەوە، بەڕاشکاوی دەیگوت:

– ئەی فەڵەستینیی گەندەڵ دەبێت دانی پێدا بنێیت، کە تۆ سیخوڕی و بەعسییە سورییەکان پاڵیان پێوە نای سیخوڕیمان بەسەردا بکەیت.

بەدەنگێکی پچڕ پچڕ و بەسوێوە گوتم:

– من لە هەموو ژیانمدا خێوەتگەی عێنل حیلوەم جێ نەهێشتووە، ئەمەش

هەر یەکەمین گەشتە لە ژیانمدا دەیکەم بۆ بەغدا.

کەچی ئەوی دەمگوت ڕەتی دەکردەوە و تفی لێ دەکردم:

– بیری خۆتی بێنەوە ئێستا ژنەکەت لە کوێیە. ئەو کات تێ دەگەیت هەی دەیبووس، ئەی سیخوڕی بارگیر.

هەشت مانگ لەسەر ئەم بەزمە هێشتمیانەوە، لێکۆڵینەوە و لێدان و جوێن، کابرا پێی ڕادەبواردم، نەمدەزانی خانەوادەکەم لە خێوەتگەی عێنل حیلوە چی بەسەردا هاتووە، هیچیشم لەبارەی سامیەی ژنمەوە لە شاری زانکۆیی نەدەزانی، داخۆ دەبێت هەر لەوێ مابێت؟

تاقە جارێک داوام لێ کردن نامە بۆ کەسوکارم لە خوارووی لبنان بنووسم، چون داوای کاری نەکردەنیم کردبێت بەشێوەیەکی وا دڕندانە لێیان دام ناچێتە مێشکەوە، یەکیان گوتی:

– کوڕی قەحپە بۆ وادەزانیت لە کوێی؟ لە لەندەن یا لە پاریس؟ دەتەوێت نامە بنووسیت؟ لاریمان لەسەر نییە، بینووسە و بیخەرە قوونتەوە.

پاشان وەکو شێت پێکەنی:

– ئەم قوونەی تۆ باشترین پۆستەیە دەکرێت بۆ نامە گەیاندن سوودی لێ ببینرێت.

***

زیاد لە ساڵێک تێ دەپەڕێ و من هەر لەم تاریکستانە لەبیرکراوەدام، گۆڕێکە لەو گۆڕە زۆر و زەبەندانەی بەسەر زامەکانی ژێرەوەی بەغدادا دابەش کراون، کە هیچ ڕێبوارێکی ڕاگوزەر نایانبینێت، ڕۆژی بەسەدان جار دەسووتێم، لە پێنجی ئەیلوولی ١٩٨٤دا وەردیانەکە دەری کردم و بردمی بەرەو نووسینگەی ئەو سەرهەنگەی سووکایەتی پێ دەکردم و دەیگوت:

– تاسەی ژنە جوانەکەت ناکەیت؟ ئێستا بۆ بینینی هاوڕێ مەجید سەعدوون دەڕۆیت، ڕەنگە ژنە داوێنپاکەکەشت لە نووسینگەکەیدا ببینیت.

پاشان چون گورگ بەدووی نێچیرە گێژ و وێژەکەیدا ڕادەکات، بزەیەکی

هاتێ، تووڕەکەیەکیان لەسەر نام و وەک ئەوەی مەڕێکی وەڕسکەر بم، فڕێیان دامە ئۆتۆمۆبێلێکەوە، دوای سی ترس و گومان خەیاڵکردن و هەنگاو و شێتکردن، وەک ئەوەی جەواڵێکی بەتاڵ بم و هیچ بەهایەکی نەبێت دایان بەزاندم، تووڕەکەکەیان لە سەرم کردەوە و خۆم لە ناو ژوورێکدا بینییەوە مێز و قەنەفەی تێدا بوون، بێ ئەوەی ئەو زەمەنە بزانم، کە تێیدام و ئەو شوێنەشی، کە بۆی هاتووم، لە درزی دەرگەی ژوورەکەی تەنیشتەوە بەلای ڕاستمدا گوێم لە دەنگی جیا جیا بوو، لە نێوانیاندا دەنگی مەجید سەعدوونم هەست پێ کرد، دەیگوت:

– ژنەکەی و... لێی تێر بووین، دەمەوێت وەکو دەڵەسەگ تووڕی هەڵدەن، هەرچی ئەم سیخوڕەیە دەبێت بەختەتی خۆی دانی پێدا بنێت، کە سیخوڕیی بۆ بەعسی سووری دەکرد.. پرسەکە زۆر ترسناکە، بەرپرسی بەعسی سووری پرسیاری ئەم سوێرکییە و خێزانەکەی دەکات.

زیاد لە کاژێرێک بەتەنێ لەو ژوورەدا مامەوە، ئەو زراوچوونەم دەبیست، کە کاسی کردبووم، لەگەڵ ئەو تۆقینەی خەریکبوو لە پەلوپۆی دەخستم (لە ئەشکەنجەدانی بەردەوام بن، تاکو دانی پێدا دەنێت).. لەنکاوڕا دەرگەیان کردەوە، سامیەی ژنم بەنیوە ڕووتییەوە، کە جگە لە گەلاتوویەک هیچ دای نەپۆشیبوو هاتە ژوورێ، بەدەم گاڵتەپێکردنەوە دەرگەکەیان لەسەر داخستین، هەر هێندەی خۆمان بەم ئاوایە بینییەوە، لە پرمەی گریانێکی سەیرمان دا، کرژبوونەوە و ئاهـ هەڵکێشان و ترس و سامی بێ پایان، هەینێ ژنەکەمم بەم ڕووتییە شەرمهێنەرە بینی خەریکبوو شێت دەبووم، کەچی ئەو توانی بڵێت:

– ئەوی دەیبینیت زۆر ئەهوەنترە لەوەی مەجید سەعدوون و پاسەوانەکان و لێخوڕەکەی بەدرێژاییی ساڵی ڕابردوو پێیان دەکردم، ناتوانم ئەوی ڕووی دا بۆتی بگێڕمەوە، دەبێت دانی پێدا بنێیت، کە تۆ سیخوڕیت، ئەگینا بەدرێژاییی ژیان لە گرتووخانەکانیان و لە ژێر بەزەییاندا دەمێنینەوە، هەرچی منم، بەخۆت دەبینیت، جگە لە کەنیزەکێکی هەرزانبەها پتر نیم، کەنگێ بیانەوێت لەم ژووری نووستن بۆ ئەو ژوور دەمگوازنەوە.

ئەوی بینیم تەنیا وێنەی زەمەنێکی تیژتێپەڕ نەبوو، ناماقوولّم بینی دەجووڵێتەوە، گریان تەنیا دۆخێکی ونبوون بوو، ئەم بەرپرسە حزبییە ژنەکەمی لە ئەپارتمانێکەوە بۆ ئەپارتمانێکی تر دەگواستەوە و ناچاری دەکرد مەی بخواتەوە و جگەرە بکێشێت، هەروەها سەماکردن لە بەردەمیدا بەجلی نیوە دڕاوەوە، تاکو زیاتر حەزی بجۆشێ و ئارەزووی هەڵسێت، پاشان سواری بێت، دوای ئەوەیشی لێی تێر دەبێت، بۆ پاسەوانەکانی جێی دەهێڵێت، تا بەڕیز دەستدرێژی بکەنە سەری.. ئیتر ڕۆژانە بەم چەشنەی دەباتە سەر.

باسی بۆ کردم چۆن جارێکیان لە سەرخۆشییەکەی بێدار بووەتەوە خۆی لە ژێر پاسەوانێکدا بینیوەتەوە پێی پێ دەکەنێت، ئەمیش بەدەم گریانەوە پێی گوتووە:

– شەرم ناکەیت، خۆت بەبەعسی دادەنێیت و سواری خوشکێکی فەڵەستینی دەبیت.

کەچی ئەو بەلێدان کەوتووەتە گیانی و هاواری بەسەردا کردووە:

– هەی قەحپەی کچی قەحپە، پیاوەکەت سیخوڕە، ئەی ئیتر بۆ سوارت نەبین.. ئیسرائیل فەڵەستینی داگیر کرد ئێمەش تۆ.. چی تێدایە؟ کفرە؟

کاژێرێکی تەواو لە گریان لەگەڵ ژنەکەمدا جێیان هێشتم، نیو کاژێریش لە واقوڕمان، بەتەنێ سەرنجمان دابووە ئەو مێردمزمەیەی کەوتینە پاڵتۆ زلە قورسەکەیەوە، بەر لەوەی زیاتر سەرسوڕمان بمانگرێتەوە و ترس و سام دامان گرێت، هەمان بەرپرسی حزبی وێڕای سێ پاسەوان هەڵیان کوتایە ژووری و یەکێک لە پاسەوانەکان پەلاماری ژنەکەمی دا و ئەوی لەبەریدا مابوو دایدڕی، لە بەردەمماندا بەڕووتی وەستا و لە حەژمەت و لە تاواندا چاوانی لە قەپێلک دەرهاتن، بێهوودە دەکۆشا بەدەستەکانی عەورەتی داپۆشێت.. کابرای بەرپرس پاڵی نا و لەسەر پشت کەوتە سەر زەوییەکە، ویستی ڕاستبێتەوە، کەچی بەپێڵاوەکانی شەقێکی تێ سرەواند و گوتی:

– ها؟ دانی پێدا دەنێیت؟ یاخۆ لەو گەنجە بگەڕێم بەبەرچاوتەوە سواری بێت؟

بەرگەی ئەوەم نەگرت، کە لە ساتێکی زەمەنی ونبوون و بێ سەرەو بەرەییدا ڕووی دا، دنیا دەیخوولاندمەوە و بەرەو ئەشکەوتی تاریکیی دەبردم، جگە لە بۆن بۆگەنی و بۆنی جەستەیێلی هەلا هەلا بووم نەدەدیت، پێم گوت دانی پێدا دەنێم، بەڵێ، من سیخوڕی بەعسی سووریم، هەروەها کێت دەوێت من سیخوڕی ئەوەم، چیشتان دەوێت بۆتانی دەنووسم.

ئەشکەبووسەکە دای لە هاڕەی پێکەنین، ڕووی کردە پاسەوانەکە و پێی گوت:

– سیپاڵەکانی ئەو (حورمەیە) بێنە.

ئینجا کاغەزێکی دایە دەستمەوە تێیدا نووسرابوو:

من هاووڵاتیی فەڵەستینی محەمەد جەمیل سوێرکیم، لە خێوەتگەی عەینل حیلوەی خوارووی لبنانم، لەدایکبووی ساڵی ١٩٦٠م، بەتەواوی توانای هزریمەوە و بێ هیچ پاڵەپەستۆیەکی دەروونی، یاخۆ جەستەیی بەڕاشکاوی دانی پێدا دەنێم، من لە ئابی ١٩٨٢دا هاتمە بەغدا، لەلایەن بەعسەوە لە دیمەشق لە ڕێگەی بەعسی لبنانییەوە نێرراوم، تاکو لە زانکۆی بەغدا لەگەڵ سامیە عومرانی ژنمدا وەکو پەردەپۆشکردن بخوێنم، تاکو سیخوڕی بەسەر هاوڕێیانی بەعسی عێراقەوە بکەم، زانیارییەکانم لە ڕێگەی لێخوڕی بارهەڵگرێکەوە دەناردن، کە لە ڕێگەی نێوان دیمەشق و بەغدایا ئیشی دەکرد، بەشێوەیەکی پلان بۆ دارێژراو، بۆ سوود وەرگرتن لە مێیینەیییەکەی و بۆ گەیشتن بەو سەرکردانەی دەمەویست زانیارییان لەبارەوە کۆ بکەمەوە، ژنەکەمم لەگەڵ خۆدا هێنا. گەواهیی ئەوە دەدەم خۆم و ژنەکەم لە بەندیخانەکانی عێراقدا مامەڵەی باش و بەخشندەیی زیندانەوانەکانمان بینییەوە، من لەوەی کردوومە داوای لێبووردن دەکەم، هەروەها ژنەکەشم.

کاغەزەکەم خوێندەوە و هێشتا ژنەکەم ڕووتوقووت بوو و پاسەوانەکە لە

گەڕاندنەوەی جلەکانیدا خۆی دوا دەخست، هەر جارێکیش لە سۆنگەی سەیرهاتنەوەم بەوەی لە کاغەزەکەدا هاتووە لە خوێندنەوە بووەستامایا، بەرپرسەکە پێشم دەکەوت و دەیگوت:

- ها.. کورە دوایی بەبەرچاوتەوە دەستدرێژیی دەکەینە سەر، کاغەزەکە بگرە و لەسەر ئەم مێزە (بەتوندی دای نیشاندم) دابنیشە و ئەوی خوێندتەوە لەسەر کاغەزێکی تر بینووسەرەوە.. دەمانەوێت بەخەتی خۆت بێت، تێگەیشتی؟

چی گوت وام کرد، وەکو مارێک خۆی لە کون مەڵاس دابێت بۆ نێچیرێکی تۆقیو و ترساو ئاوا چاوی تێ بڕیبووم، هەینێ لە نووسینەوەی بوومەوە، خوێندییەوە و بەسەر ڕاوەشاندنەوە گوتی:

- کوڕی باشیت، کوڕێکی گوێڕایەڵی و شایانی ئەوە نیت بەبەرچاوتەوە سواری مەدام ببین.

پاشان ئامێرێکی تۆمارکردنی هێنا و هێشتا لە کونەکەیدا خۆی مەڵاس دابوو و کاتی کوشتنمی دەستنیشان دەکرد:

- ئێستا، لەسەرتە کاغەزەکە بەدەنگی بیستراو بخوێنیتەوە، دانپێدانانەکانت بەدەنگی خۆت تۆمار بکە.. قسەی ڕوونم دەوێت، بێ ترس و لەرزین.

دەنگم ئەوەی دووبارە دەکردەوە، کە لە کاغەزەکەدا نووسرابوو، ئینجا تۆمارکەر و کاغەزەکەی برد و بەهەر سێ پاسەوانەکەی گوت:

- ئەم ببەنە ئەو مەزرایەی تێیدا بوو، مەزراکەی مامۆستا، هەرچی ئەم سیخوڕەشە بیگەڕێننەوە زیندان، تاکو ڕۆژی دادگاییکردنەکەی دێت.

پاشان وا دیقەتی دام چون سەدان ساڵ بێت دوژمنایەتی لە نێوان من و ئەودا هەبێت:

- ئینشاڵڵا حوکمەکەت لەسێدارەدان دەبێت، بەچکە سەگ، لەمەودوا کەس دادت نادات، نە بەعسی لبنانی و نەیش بەعسی سووری.. تەنانەت خواش

بەهاناتدا ناگات.

گەڕاندمیانەوە جێگەکەی خۆم، پێش ئەوەی تووڕم هەڵدەنە ژوورە تاریکەکەمەوە، سەرهەنگ جاسم مەعانی داوای لە پاسەوانەکان کرد لە نووسینگەکەیدا چاوەڕێی بکەین، تاکو لەو گەڕانە کورتەی بەناو بەندیخانەکەدا دەبێتەوە. کاتێک گەڕایەوە داوای لە پاسەوانەکان کرد بچنە دەرەوە، پاشان پرسیاری ئەوەی لێ کردم داخۆ چی لە نووسینگەی بەرپرسە حزبییەکەدا رووی دا؟ منیش بێ کەم و زیاد گشت شتێکم بۆ گێڕایەوە، وێڕای ئەوەش لێی پرسیم:

– کاغەزەکەت بەدەستی خۆت نووسی؟ ئایا ئەوی تێیدا هاتبوو ئەوەشت هەر بەدەنگی خۆت تۆمارت کرد؟

هەینێ پێم گوت (بەڵێ) پێکەنی و گوتی:

– بڕوانە بەستەزمان، لەمڕۆوە تەنانەت پەروەردگاریش ناتوانێت هیچت بۆ بکات، لێرە لە بەغدادا دەمریت و تکاکاریشت نابێت.. بەدەستی خۆت ژیانی خۆت وێران کرد.

لە بەردەمیدا بەکوڵ گریام، سوێندم بۆ خوارد، کە بێتاوانم و پێوەندیم بەکەسەوە نییە و من بۆ خوێندن هاتم و هیچی تر.. کەچی گوتی:

– هەمووومان دەزانین تۆ بێتاوانیت، گرفتەکە تەنیا لەوەدایە بەرپرسە حزبییەکە دڵی چووە ژنەکەت و بۆ خۆی ویستی، بۆیە دەبوو تۆمەتێکی ماقووڵ و گونجاوت بۆ هەڵبەستن، تاکو لێی دوورت بخاتەوە و تەنیا بێت لەگەڵیدا، لەو دەمەوەی تۆ لە زیندانیت ئەو لە مەزراکەیدایە.

پاشان بەدەم سەرلەقاندنەوە گوتی:

– بەس دوای نووسینی ئەو کاغەزە و تۆمارکردنی دەنگت و دانپێدانانت بەسیخوڕی (بەفەرمی) هیچ شتێک دادت نادات، تۆ دانت پێدا ناوە، کە سیخوڕیت.

پاشان گازی پاسەوانەکانی کرد و گەڕاندمیانەوە زیندان، لەو ساتەدا زانیم

من فەوتام و بەهیچ کلۆجێک ڕزگاربوونم نییە، لێرە هیچ یاسایەک نییە مامەڵەی زیندانییەکان دیار بکات، جگە لە هەوەس و ئارەزووی زیندانەوان و بەرپرسی زیندان، هەمووشیان نەخۆشی و ئاڵۆزییەکانی خۆیان بەدارکاریکردنی بێ بەزەییانە و بێ هۆ و جوێندان بەئێمە دەردەکەن، هەندێک لە وەردیانەکان پرسیاری ناونیشانی کەسوکار، یاخۆ خزمەکانت لێ دەکەن، بواری ئەوە هەیە پارمەتیت بدات، ئەگەر شتێکی وای لە کەسوکارت وەرگرت شایانی سەرکێشی بێت.

قۆڵبڕین بەڕۆژی نیوەڕۆ، لەبەر ئەمەیە دەبینیت زیندانییەک دڵخۆشە و یەکی تر خەفەتبار و دەستەوستانە، چونکە کەسێک نییە لەباتی ئەو (باج) بدات.

لە دوا دوایی تەمـــــووزی ١٩٨٥دا و پاش دوو ســـــاڵ لە دڕندەیی و دارکـــاریکردنی ناڕەوا، لەو ژوورە تاریکە دەریان هێنام و بردمـــیان بۆ نووسینگەی بەرپرسی زیندانەکە، ئەو پێی ڕاگەیاندم لێخۆشبوونێکی سەرۆکایەتی خۆم و ژنەکەم دەگرێتەوە، بۆیە دەبێت نامەیەکی منەتباری بۆ بارەگای جەنابی سەرۆک بنووسم.

لە خۆشیی ئەو هەواڵەی لە کۆتاییی تەمووزدا بیستم، کە گەرما لە پەنجا پلەی سەدی تێپەڕاندبوو و دەیبرژاندین، خەریک بوو بکەومە سەر زەوییەکە.. پێم گوت:

– بێگومان دەنووسم، خوا ئێوە و سەرۆکی فەرماندەمان بۆ بهێڵێت..

قسەکەی پێ بڕیم:

– بڵێ خوا بیپارێزێ و پایەداری بکات، هەی بێ مێشک.

دە جار گوتمەوە ڕەنگە زیاتریش، گرینگ ئەوەیە ئەم دۆزەخە جێ دەهێڵم و ناگەڕێمەوە سەری، لە زیندانەوە بۆ پاسێکی ژەنگاوییان بردم، پتر لە بیست ئافرەت و پیاوی تێدا بوو، لە نێوانیاندا ژنەکەی منیش.. دوای چەند کاژێرێک لەسەر سنووری سووریا فڕێیان داین، ئەو بێنەوبەرەیەی دوای بڕینی هەر کیلۆمەترێک لەو بیابانە کاکی بەکاکییەی لە قرچەی گەرماوە بۆ ئاگر درێژ

دەبووەوە دەمانبرِی، پێ بەپێ توندتر دەبوو..

چەند ڕۆژێکمان لە بەندیخانەیەک لە دیمەشقدا بەسەر برد، پاشان گەڕاینەوە خێوەتگەی عێنل حیلوە.

تا ئێستاش بڕوا ناکەم لە دەستیان قوتار بوومە، هەرچەندە ژنەکەم گەیشتبووە ڕادەی ئالوودەیی لەسەر مەی، لە سۆنگەی ناچارکردنی بەخواردنەوەوە لە گشت ڕۆژێکدا، من تەندروستیم باش نییە و لەوانەیە باشیش نەبمەوە، بەردەوام وەکو شێت بەخۆمم دەگوت:

- ڕاستە من لە چنگیان ڕزگار بوومە؟ ئەرێ شتی وا لە هیچ شوێنێکی دنیادا ڕوو دەدات؟

خۆزگە نە بڕۆیشتمایا و نە بەغداشم ببینیایا، ئەوەتا شەوانە لە شیرن خەودا ڕادەپەڕم و میز بەخۆمدا دەکەم، مەجید سەعدوون دەبینم ژنەکەم و ئازادی و ئاوی ڕووم لێ زەوت دەکات، دەیبینم بەڕووتی لەسەر ژنەکەمە و ئەویش لە ترس و ڕیسواییدا نالەی دێت، پاسەوانەکان دەبینم وەک چۆن نۆرە بۆ قسەعەی خواردن دەگرن و پەلاماری دەدەن، ئاوا بەدوای یەکدا نۆرەیان لەسەر گرتبوو، ئاخۆ بەڕاست من لەو کوشتارگە ترسێنەرە دەرچوومە؟ ئەوە منم لە عێنل حیلوە لە ماڵی خۆم و لە نێو دراوسێکانمدام؟ ڕۆژانە لە خۆم دەپرسم:

- ئەی هاوار، خەڵکی عێراق لە چ دۆزەخێکدا دەژین؟(*)

---

(*) ئەم بەشە (بەدەستکارییەوە) لە کتێبی (فلسطينيون في سجون الطاغية)وە وەرگیراوە، خەولە ئیبراهیم ساڵی ٢٠٠٤ نووسیویەتی و چاپخانەی الانصار (بەیرووت-لبنان) بڵاوی کردووەتەوە. (نووسەر)

## ئەمین هاشم بەیتار

ئایا هەڵاتن بوو لە دۆزەخەوە بۆ دۆزەخێکی تر؟ ئەو کابرا ڕەقەڵەیەم باش لەبیرە، کە پێیان دەگوت فەیلەسووف، لەودیو دیوارەکانی شەماعیەوە سەمای دەکرد، شتی بێ سەرەوبەرەی سەبارەت بەشێتبوون و لۆجیکی زیندان دەگوت، هەروەها لەسەر ئەوەی چۆن مێشووله واقعیترە لە مرۆڤ، قسەی سەیر و سەمەرەی هەمبەر ئەو گۆشت ئەنجنە دەگێڕایەوە، کە هەرگیز لە لەقوتوونانی مرۆڤ لە شێوەی سەردین هیلاک نابێ، دەربارەی ئەو نێچیرەی بەر لە کوشتنی دەیبۆڕاند و هاواری بۆ ئیبلیس دەبرد، ناوی (مێری)، یاخۆ شتێکی لەو بابەتە بوو، پزیشکی سەرکوتکردنم لە یادە چۆن بەفەیلەسووفی نەخۆشخانەکە دەخەنییەوە و لە سەرەتای ناوەکەی لەبری پیتی میم (کاف)ی دادەنا، مێری گوێی بەو قسانە نەدەدا و تەماشای ناوەکەی نەدەکرد، کە بووەتە شتێکی دیکەی درێژتر، ئەو تا سەری نوقمی دووکەڵە جگەرە و بەتایبەتکردنی شوێن و ئایدیۆلۆجیای ڕێکخراوە نهێنییەکان بوو، هەموو کات مقەیەتی چاویلکەکەی بوو و سکاڵای لە شکانی ئەو چوارچێوەیەی دەکرد، کە لە مارکەی (میشێل فۆکۆ) دەچوو.. هەر جارێکیش لە چوون و هاتنەوەدا لە بینینی ڕۆڵی گوێدرێژدا دەمبینی، گوێم لێ بوو لەگەڵ پەنجە هەڵبڕین بۆ ئاسمان دەیگوت:

– لە مرۆڤدا شتێکی بنەڕەتیی ناتەواو هەیە، تەمبەڵەکان ژیرترین جۆری بنیادەمن، دارتەرمە کەشخەکان بەرەو کایەی سەماکردن بەڕێوەن.

***

هیچ هەواڵێک لە کوێخا نییە، بەبەردەمی ماڵەکەیدا ڕەتبووم و لەسەر سەکۆی پێش دەرگەکەی دانیشتم، بەڵکو بمبینێ و ئەوەم پێ بڵێت، کە چیم بۆ

دەکات، پێنج ڕۆژ گێژووێژ پەلەکوتێم بوو و ڕادەچەنیم، شێتییەک دەیبرِی و دەیگرتمەوە و لە نیوەشەویشدا درێژتر دەبووەوە، بەر گوێم کەوت یەکێک دەڵێت (دوێنێ شەو کوشتیان) ئیتر نەمزانی کێیە کوشتوویانە، بەهەڵەدا نەچووبم یەکێک پەنجەی بۆ لای ماڵی کوێخاوە درێژ کرد، پاشان بۆم دەرکەوت ئەو کابرا مۆنەی دەیترساندم بەر لەوەی نامەکەی لە درزی دەرگەکەوە بۆ جێ هێڵم، هەر بەڕاستی مردووە.

لە باڵەخانەیەکی نیوە سووتاو نزیک دەبوومەوە، لە هەموو شت بەتاڵ بوو لە وردە شووشە نەبێت، کەسی تێدا نەبوو، تەنیا ئەو کۆترە زاجلە نەبێت، کە جیقنەکانی لەسەر دیوارەکە کۆ دەکردەوە، سەرخەوێکم لە ژوورێکدا شکاند دەیڕوانییە سەر ڕووباری دیجلە، بیرم لە (مێری)ی فەیلەسووف و ئەو پێشکەیە کردەوە، کە لە مرۆڤ بەئاوەزتر بوو، بەدرێژاییی شەو من لە ڕووبارەکە ڕامابووم، چەند ساڵ بەسەرچووە و ئەو لە باکورەوە بەرەو باشوور ڕێ دەکات؟ چەند ساڵی تر تێ دەپەڕێت ئەو لەسەر ئەم دۆخە دەمێنێتەوە زەوییەکەی هەڵدەکۆڵێت و مێژووی خۆی دەنووسێتەوە و ناوی لە نێو مرۆڤاندا دەگەشێتەوە.. مەرگی ئەمین هاشم بەیتار چی دەگەیەنێت، کە چەندێک تەمەنی درێژ بێت لەگەڵ ژیانی ڕووبارەکەدا بەراورد ناکرێت، یاخۆ بەژیانی شاخەکان و ئەو ئاسمانەی درێژ دەبێتەوە بۆ ملیارەها نەیزەک و ئەستێرە و ئەو نادیارانەی هیچ مرۆڤێک پەیان پێ نابات، چ بایەخێکی هەیە بمێنم و نیوەی کاتم شێتبم و منداڵانی گەڕەک بەهۆیها بکەونە دووم و بەئاگا و بێ ئاگا گاڵتەم پێ بکەن؟ کاتی ئەوە نەهاتووە دوای ئەم تێکچوونەی تووشی مێشکم بووە، کۆتایی بەژیانم بهێنم؟ چاوەڕێی چیم؟ دەکرێت دوای ئەم هەموو ساڵە بیژووانەی لە دوای خۆمەوە جێم هێشتن بایەخم پێ بدرێت؟ نیوەی هۆشم لە تەماشاکردنی ڕووبارەکە ماندوو بوو و کاتی بەرەو شێتبوونی ڕاگەیاند، لە فێ دەچێت، هەستی پێ دەکەیت پێش ئەوەی بەتەواوی بتگرێت، پەرکەم بەهێوری دێت و مێرووله ئاسا دەخزێتە کونیلەکانی پێستمەوە، هەینێ شێتێش لە پڕ دەتگرێت، سەگەل بەر لە پەلاماردانیان بۆ سەرت هەستی پێ دەکەن، گوێم لە

حەپەی سەگە لە خوارەوەی باڵەخانەکەوە دێت، دیجلەش خێراتر ڕێی دەکرد، سەرم بەدیوارەکاندا دەکێشم، کوڕی قەحپانە، چەندێک ساڵەکان تێپەڕن شەڕ من لەگەڵ ئێوەدا تەواو نابێت، نەخێر، نامەوێت ئەم زەڕە زەڕە ببینم، یاخۆ ببیسم، لەوێ ئۆتۆمۆبێلێک بەقوڕ سواخ دراوە، منیش بەسۆز و خۆشەویستی سواخ دراوم، سۆز و خۆشەویستی بۆ کێ؟ دەمەوێت لەسەر جێیەک بنووم لە ئاوریشم و گوڵی زافەران چێ کرابێت، دەبێت مۆمی زیاتر هەبن، تاکو ناپاکی ببینم، ئایا ناپاکی نووتەک و ڕەشە؟ کۆمەڵێک ژان و مووشەکم هەن لە برادەران دەکەن، مێری دەڵێت:

– ئەو دەزووە باریکەی لە دووکەڵی جگەرەکەمەوە هەڵدێت، لە من زیاتر بڕوای بەخۆیەتی.

داخۆ ئەم مێرییە شایان بەوەیە لە نێوان شێتەکاندا بێت، لە کاتێکدا گشت شتێک سەبارەت بەبەتایبەتکردنی مێشوولە و ڕێکخراوە نهێنییەکان دەزانێت؟ ئایا شایان بەوەیە پیتی میمی سەرەتای ناوەکەی بکوژرێت، بۆ ئەوەی ناوی بزرێنرێت؟

***

هەینێ سەرم کێشا و لە دیجلەم ڕوانی، هەستم کرد دەگەڕێمەوە بناغە و ڕەگی خۆم، ئەمجاریان ساتەکانی ڕابوونم درێژەیان کێشا، ڕەنگە کاتی شێتییەکەمی بەسێ جاران بواردبێت، لەوەیە ئەمەش مانای چاکبوونەوەی بەم زووانەم بێت، ئەگەر دۆخەکەم بەم ئاوایە بەردەوام بێت، دۆستەکانی خۆمم بیرکەوتنەوە هەروەها هەستم بەبرسییەتییش کرد، ئەمانەش نیشانەی هۆشیاریی سەدا لە سەدە، تەنانەت پێویستم بەخوێندنەوەیە، ئەمەش لە مێژە ڕووی نەداوە، دەخوێنمەوە تاکو تەنگ بەشێتی هەڵچنم و پانتاییەکە فراوانتر ببێتەوە، سەرنجی جلەکانی خۆم دا (چۆن بەم سیپاڵە شڕانەوە بەناو خەڵکیدا ڕێ بکەم)؟ ئێستا یەکسەر دەچمە لای ئەو پیاوەی پیرێژنەکە ڕای سپاردبوو ئاگای لێم بێت و ئەوەشی پێ ڕاگەیاندبوو، کە بەم ڕۆژەی گەیاندم، بەڵکو کراس و پانتۆڵێکم بۆ بێنێت جیا لەم کراس و پانتۆڵەی خۆم، کە لە تەپوتۆزی

ڕێگە دەکەن، دوور نییە ئەگەر بیەوێت لەگەڵیدا کار بکەم، با لە بەرابەریدا خۆم وەکو سوالکەر نیشان نەدەم.

لە ڕێگەمـــدا بەرەو گــۆڕەپانی تەیەران، دەڕۆیشـــتم و خـــۆم تەواو قـــیت کـردبووەوە، نە منداڵێک هۆیهای لێ دەکـێشـام و نە دەنگێکی سـۆزانـییش گاڵتەی پێ دەکردم، جلەکانم مایەی پێکەنین بوون، بەڵێ، لێ سەرم بەرز بوو، ئەو هێزەی لە جەستەمدا ماوە دەیپارێزم، لە گۆشەیەکی شەقامەکەدا کابرایەکم بینی کۆوار و کتێبی کۆنەی دەفرۆشت، کتێبی (لە بێدەنگییەوە بۆ دەنگ) لە نێو ئەو کتێبانەدا بوو، کە بەنرخی خۆڵ دەفرۆشران، کەچی من مشتەخۆڵێکیشم نەبوو، تاکو کتێبەکەمی پێ بکڕم.

کابرای کتێبفرۆش بینی چاوم لەو کتێبە بڕیوە، هەڵی گرت و گوتی:

– ئەمەت بەدڵە؟ بۆ نایکڕیت؟

لەو دەمی لە شەرماندا سەرم دانەواندبوو، گوتم:

– تا بڵێی بەدڵمە، وەلێ پارەم پێ نییە.

کابرای کتێبفرۆش بۆی درێژ کردم و گوتی:

– بیگرە، کەنگێ پارەت بوو وەرەوە بمدەرێ. زۆر هەرزانە.

ئەو حەزەم لا ڕوا پێی بڵێم (من دانەری ئەم کتێبەم)، لێ کابرا بەم جلە شڕانەوە مەزەندەی خراپم لێ دەکات، ئەو کات هەلی پێدانی کتێبەکەش لەدەست دەدەم، بۆیە پێم گوت:

– سوپاس، بەپشتیوانی خوا لە نزیکترین کاتدا پارەکەیت پێ دەگات.

بلەز هەنگاوم دەنا و خەریکبوو لە خۆشییاندا باڵ بگرم.

لە گۆڕەپانی تەیەراندا بەخۆڕایی هێند هێلکە و تەماتە و کولێرەی گەرمم خـوارد، تا مـڕ بووم، هێشـتا لە تەواوی بەهۆشـیدام، هیچ ئاماژەیەک نییە پێچەوانەی ئەمە دەربخات، بەکابرام گوت:

– دەمەوێت پارەتیت بدەم.

بزمیەکی بۆ کردم:

- کارەکەی من تەنیا پێویستی بەیەک کەسە.

بەنیمچە شەرمێکەوە گوتم:

- ئاخر ماقووڵ نییە من...

قسەکەی پێ بڕیم و گوتی:

- ئەوە وەسیەتی دایکمە، ئەمەش تابڵێی پێم خۆشە.

پێم ڕاگەیاند، کە ئاتاجی کراس و پانتۆڵێکم، گوتی سبەی کاتژمێر حەوتی ئێوارە سەرم لێ بدە.

لەو کاتەی بۆی دانام، بینیم کراسێکی شین و پانتۆڵێکی ڕەش و جلی ژێرەوەی بۆ هێناوم، گوتی:

- ئەمە هەندێک سیپاڵی خوالێخۆشبووە، دەبێت لە پیسیی شەقام بیانپارێزیت، زۆرێک لەو جلانەمان نەماوە لەگەڵ درێژییەکەتدا بگونجێت.

بەر لەوەی جێی بهێڵم، تێری کردم و دوو دیناری پێ دام و پتر لە کاژێرێک بەتەک خۆیەوەی دانام، دوو چایم هەڵقوڕاند، هەینێ بیرم لە باشیی ئەم جۆرە کەسانە دەکردەوە پڕ قوڕگم لە گریان دەبوو.

***

دوو ڕۆژ دوور لە شێتی، زیاد لە پەنجا کاژێرە من بەئاوەزێکی تەندروستەوە دەژیم، لێ ترسم لە دەسەڵاتی شێتیی لە ناکاو دەیتۆقاندم و لێنەدەگەڕا سەرکێشی بکەم و ڕۆڵی خۆم لە نێو خەڵکیدا ببینم، من خۆم ئەوە باش دەزانم شێتی تاقە ڕاستییەکە پێویستی بەکەسی تر نییە، وەکو چۆن شوانی شێتیی گوێدرێژان و فەیلەسووفی شەماعیە لە بەغدادا وا دەڵێت.

دەستم بەخوێندنەوەی کتێبەکەم (لە بێدەنگییەوە بۆ دەنگ) کرد، پیت و وشە و دێر و وێرگوڵەکانم وا لە بیرن دەڵێی ئێستاکێ دەیاننووسم، باشە بڕوا بەخۆم بکەم، لە کاتێکدا من ئەو شێتەم، کە لە شەماعیە قایمیان کرد، هەتا لە یەک کاتدا مرۆڤبوون و ئاوەزی تێک بشکێنن، وا دەزانی بەڕاستی بڕوا بەوە

دەکەم، ڕۆژگارێک من قسەی وام نووسیبێت، پەیڤەکان دەبینم لە ناو دەستمدا سەما دەکەن، تێیدا دەڵێم:

– لەسەر منارەیەکەوە، یا بەلووتکەی چیایەکەوە، کە هەر کاتێک پێی گەیشتن یەکسەر دێنە پرسیار و دەڵێن:

ئەی باشە لەودیو چیایەکەوە، یاخۆ لە پشت منارەکەوە چی هەیە؟ قەدپاڵێک، یاخۆ بیرێک، یا هەزار بەهەزارێک نییە تەماشا بکەن، چونکە کەسیان گریمانەی ئەوە ناکات بکەوێت، کەسیشیان تێدا نییە لە مێشکیدا شێوەی کۆتایی وێنە بکێشێت. ئیمپراتۆرێتێک لەسەر تەختەی سووتاو، هەروەها پاشایەتێک لەسەر کورسییەکی لە درۆ هەڵبەستراون، هیچ یەکێکیان بڕوایان بەوریابوونەوەی ویژدان، یاخۆ هەڵکەندنی ڕووباری سێیەم، یان گەشتێک بۆ کۆنگرەی داهاتووی ئەدەب نییە، لە کاروانەکەیدا شوێنیان بۆ نەگیراوە و کەسیش پرسیاریان ناکات.. چۆن؟ توخوا ئەمە ڕەوایە، بەدرێژیی تەمەنمان ئەوان بەتەنێ خۆیان دەرگەی (سمسم) دەکەنەوە و هەر ئەوانیش بەڕاست و چەپدا جیهان دەبینن؟ هەروەها بەدرێژی ژیانمان گۆشتمان دەخۆن و تفمان بەسەردا دەکەن؟ تێربوون تا ڕادەی خاوبوونەوە، هیچ دەستکەوتێکمان نییە جگە لە (دەستکەوتەکانیان)، هیچ قسەیەکیش لە ڕۆژنامە و کۆوارەکانمانەوە دەرناچێت جگە لە قسەی ئەوان، کەس نازانێت زەوی خڕە تەنیا پاسپۆرتەکانیان نەبێت، کەسیش لە وڵاتی عەرەبیدا لە واتای وشەی (ملیۆن) ناگات تەنیا حیسابەکانیی بەنکیان، هەر بەڕاستی ئەم چەند ساڵەی تەمەنمان دزییان لێ کردووین و گۆشت و ئیرادەیان بردین.. بەتەنیا خۆیان خاوەن چەپەچپ و ڕاپۆرتی نهێنین، کە بێگوناه و مەڕ پێکەوە سەردەبڕێن و کەسیشیان دڵۆپێک فرمێسک بۆ (زیندانییەک) نارێژن خۆیان پشتگوێیان کردبێت، یاخۆ (کۆچەرێک) خۆیان گلاندبێتیان، یان (داهێنەرێک) خۆیان لەوتاندبێتیان، یا (مرۆڤێک) بەخۆیان لەداربڵاڵ دابێت. ئەوان هیچ شتێک لە دنیا ناگەن تەنیا ناومالی گرانبەها و ئۆتۆمۆبێلی دوا مۆدێل و سپلیتی ژاپۆنی و خواردنەوەی زۆرماوە. خۆزگە بەوەندەش وازیان بهێنایا،

بەڵکو بەفەرامۆشکردن گەلێک کەسیان لەناو دا و گاڵتەیان بەداهێنان دەهات و دانیان پێدا نەدەنا، هیچ ناوێکیش نەبوو بەجیهاندا بسووڕێتەوە جگە لە ناوی خۆیان، سەنگوسووکی لەگەڵ قاهیرەدا دەکەن لەسەر بەغدا و دیمەشق لەسەر مووسڵ و مۆسکۆش لەسەر بەسرە، ئەگەر لەودیو مینبەری شیعر، یاخۆ وتارخوێندنەوەوە بوەستن، دەبینیت (نیشتیمانپەروەری) دادەبارێت و دەڕژێتە دەرپێکانیانەوە و هێندەی نامێنێت لە خەفەتدا فرمێسک بەچاویاندا بۆ پارچەکانی عیمارە و ناسریە و هەولێر بێتە خوارێ.. ئەگەر لە شەویشدا پێکەوە کۆبوونەوە ئەوا گاڵتە بەو گەلۆرانە دەکەن چەپڵەیان بۆ لێدان و بوونە پەیژەی ناوبانگ و سەرکەوتنەکانیان، هەروەها بوونە پلیکانەی مانەوەیان بۆ دوو ساڵی تریش، یاخۆ پتر مانەوەیان لەسەر تەختی (بەخشندەیی)، کە لەگەڵ هاتنیاندا نوستووە.

***

تۆ وا دەزانی من ئەم قسانەم بۆ کێ نووسیون؟ بارودۆخی وڵات چۆن بوو، تاکو لەبارەی ڕاپۆرتە نهێنییەکانیان و داستان و شەڕ و گوناهەکانیانەوە بنووسم؟ ئەوانە کێ بوون، کە بەخوێنساردییەوە کوشتمانیان؟ من ئازا بووم، یاخۆ شێت تاکو گرەو لەسەر جەستە و ژیانم بکەم و (لە بێدەنگییەوە بۆ دەنگ)یان لەسەر بنووسم؟ لە لێکدانەوەی ڕابردوودا دەستەوەستانم، ڕۆژانی بەرەی نیشتمانی (تەڵە)یەک بوو لە ژێر پێی خۆمانماندا نامانەوە، هەینێ زیاد لە پێویست ڕۆیشتین کەوتینە تەڵەکەوە، ئەوی کۆچی کرد کۆچی کرد و ئەویشی مرد مرد، خەم و حەسرەت و داخ، کەچی من ئەمین هاشم بەیتار پەلکێشیان کردمە گەورەترین زەلکاوی عێراقەوە و لە خوێن و شێتی و پەشیمانییان نقوم کردم.

چەند بەئاواتەوەم لەو ساڵانەی لە تەمەنم ماون، مێژووی ئەم وڵاتە سەیرە بنووسمەوە، کە لە هیچ وڵاتێکی تری سەر ئەم ئەستێرە بێزراوەدا نایبینیتەوە.

لەبارەی کوشتوکوشتار و نهێنی و ناتەواوی و شەڕەوە کاولکارییە کرێگرتەکانییەوە دەنووسم، بڕوام وایە تا ئەمڕۆ مێژوو وەکو پێویست

نەنووسـراوەتەوە، ئەوی لە کتێبـەکانی کەلەپوورەوە زانیـمان و لـە قوتابخـانە و زانکۆکـاندا خـوێندمـانەوە، جگە لە دڵۆپێک ئاو لە زەریایـەکی قـووڵ و بـەریندا چیی تر نییە.

## عەمار موزهر شێخ

پێیان ڕاگەیاندم، کە محەمەد سوێرکیی فەڵەستینییان بە لێبوردنێکی (تایبەت)ی سەرکردایەتی بەرداوە، لە خۆم پرسی (ئەو زۆر شت لەبارەی هارەڕەکە و ژووری خوارەوەی سەربڕینەوە دەزانێت، چۆنیان بەرەڵا کرووە؟) وادیارە لە شوێنانی بالاوە ڕێککەوتنێک لەسەری کراوە، پێش ئەوەی لە شەکەت و ماندوویی سەفەر بحەوێمەوە (هەڵبەت هیچ هیلاکییەکی تێدا نەبوو) تۆمەتبارێکی تریان بۆ هێنام، هەر لە یەکەمین پرسیارەوە ئاراستەیم کرد، تێگەیشتم ئەمیش قوربانییەکی ترە لە قوربانییەکانی دەزگای هەواڵگری، ئەویش ژنەکەیان لەدەست کردووەتەوە و تۆمەتەکەش هەمان تۆمەتە و نەگۆڕاوە (سیخوڕیکردن بەسەر گەورە بەرپرسانی حزب و دەوڵەتەوە)، ئەمانە تۆمەتەکانیان ڕێک ناخەن و خۆیان لە داهێنانی شێوازی تری تۆمەتی گریمانکراودا ماندوو ناکەن، کۆمەڵە سەرێکی پووچ و بەتاڵن و بیر لە هیچ ناکەنەوە لە سێکس نەبێت، تەنانەت ئەگەر لەگەڵ کەر و مانگاشدا بێت، بوونەوەری بەردینن هەست ناکەن و لە ژیاندا هیچ نابینن تەنیا ڕۆچوون بەخواردندا و جەستەی ئافرەت و مەینۆشین تا ڕادەی کەوتن.

من لە هیچ یەکێک لەوان ناکەم، ئەوی بینیم زراوی بردووم، بەلامەوە گرینگ ئەوەیە هەلاتنێک هەڵبێتم گەڕانەوەی نەبێت، لێ ناهێڵن لەگەڵ عەفرای ژنمدا سەفەر بکەم، ئەو بارمتەی نەزانییەکانمە، ئەگەر ویستم ڕابکەم و لە چنگیان قوتار بم.. تاوانی عەفرا چییە ئەگەر ملی خۆم بەرەو ولاتێک شکاند بزانێت بەزەیی چییە و لە تامی بادەم و فستق و زریان بگات؟ لەگەڵ خۆیاندا بردمیان بۆ جوانترین خەون لە ژاپۆن و ڕۆما، پاشان لەسەر خۆشترین تەخت و تاراجی ئافرەتدا دایان نیشاندم، بیرم لە چی بکردایەتەوە بۆیان جێبەجێ

دەکردم، تەنانەت ئافرەتانی جیشا[٤] و نۆکەرانی ساونا و کیژانی ڤایکینگ و لەشفرۆشانی تۆکیۆ و بنگاڵ و سۆهۆ و دۆمینیکان، بەشی خۆم چێژم لێ بینین، کە جیا بوو لەو چێژ و لەزەتەی لە کۆشکەکانی پاشا و سوڵتانەکاندا دەیانبیسین، تا تەوقی سەرم لە ڕابواردنیان نقوم کردم، بەڕادەیەک لەو ڕۆژە دەترسم ئافرەت و خواردنەوەی تێدا نەبێت، وێڕای ئەوەی دەزانم سبەی چی چاوەڕێم دەکات ئەگەر بۆ هەر شتێک فەرمانم پێ بدەن، یاخۆ پێشنیازی هەر شتێکم بۆ بکەن، بڵێم (نا). کارەسات لەوەدایە دەردەسەرییەکانی من لە هی ئەوانی تر ناکات، لە نێو گیراوەکاندا ئەوە بڵاو بوو بووەوە لە ژوورەکانی ژێرەوە چی بەگیراوەکان دەکەم، لە کارەبادان و پەنجە قرتاندن و بەخەنجەر و چەقۆ پێست هەڵدڕین، هەروەها ناوی من لە درزی دیوارەکانەوە دزەی کردبوو، کە من لەم دەزگایەدا (خێو)ی تۆقاندنم، تەنیا ناوهێنانم بەسە بۆ ئەوەی کەسەکان تێک بشکێنێت، ئەگەر چەندێکیش ئازا و جەربەزە بن.

نەمدەتوانی بەر بەو قسانە بگرم، کە بۆیان هەڵدەبەستام، ئەم هەواڵانە کردمیانە شێوەیەک لە سەگی هار، یاخۆ لە شەیتانە مرۆییەکان بچم، کە خوێنی زیندانییەکان دەخۆنەوە، تا ئەو ڕادەیەی کاتێک ئەو تۆمەتبارەیان بۆ هێنام جوێنی بەگندۆرە دابوو، گوتیان جمانی بەکاڵەک داوە و مەبەستی سەرۆکی فەرماندەیە، پێیان گوت (ئەوەتانێ لە بەردەم عەمار شێخدایت ئەو چارەنووست دیار دەکات، هەی کوڕی سەگ) بینیم یەکسەر میزی بەخۆیدا کرد، پاشان بەسەر پێڵاوەکانمدا کەوت و لە ترساندا دەلالایەوە و بەدەم گریانەوە دەیگوت:

– بەخوای مەزن من سەرۆکی فەرماندەم خۆش دەوێت، خوانەخواستە چۆن

---

(٤) ئافرەتانی جیشا: بەر لە سەدان ساڵ کیژانی نازدار و پاکیزەی جیشا لە کۆشکی پاشا و میرەکانی ژاپۆندا لە کاتی میوانداریدا بەجلی ژاپۆنییەوە ئامادە دەبوون، چای و خواردنیان دابەش دەکرد و قسەی شیرینیان دەبەخشییەوە، گوڵیان ڕێک دەخست و سەمایان دەکرد و گۆرانییان دەگوت و دەیانشێلان و... (و)

دژمانی پێ دەدەم؟ لە چایخانە شۆخیم لەگەڵ برادەرەکانمدا کرد و گوتم: بڕووخێ کاڵەک، ئەم قسەیەش ئەو کات بەکار دەهێنین، کە یەکێکمان لە یاریی دۆمینەدا بدۆڕێت، گەورەم دەتوانن لە دانیشتووانی ناو چایخانەکە و خاوەنەکەی بپرسن، من ئیتر لەمەودوا دژمان بە کاڵەک نادەم و هەرگیز ناچم بۆ چایخانە و یاریی دۆمینەش ناکەم.

کە بینیم ئەم بەستەزمانە میزی بەخۆیدا کردووە و بەسەر پێڵاوەکانمدا دەپاڕێتەوە، نەمتوانی بەر بەپێکەنینەکەم بگرم، ئەو پاسەوانانەی هێنابوویان دوو جاران دارکارییان کرد، بەسەریاندا شیراندم:

– بەسە، ناو و ئەدرێس و هەندێک زانیاریی سەبارەت بەپیشە و خانەوادەکەی لێ وەرگرن، دواتر بەرەڵای بکەن با بڕواتەوە بۆ ماڵی خۆی.

یەکێک لە پاسەوانەکان گوتی:

– گەورەم، ئەمە ڕۆژانە جمان بەکاڵەک دەدات، لە ڕاپۆرتەکەیدا ئاوا نووسراوە..

لەودەمی هێشتا لە خەنینەوە نەکەوتبووم گوتم:

– خاترجەمبە، لەمرۆ بەدواوە وا ناکات، بڕوا ناکەم لەمەوداوا گندۆرە بخوات و ناویشی بێنێت، هەر ئێستا بیبەنەوە بۆ ماڵ.

لەم شوێنەدا هەموو شتێک لەسەر تۆقاندن و سەرشۆڕکردنی ئەوانەی بۆی دێن بنیات نراون، لەوەیە بەدمیان لەو بێتاوانانەی بەهەڵە هاتوونەتە ئێرە، لێرە دەرچووبن تاکو بۆ کەسوکارەکەیان مانای هاتنە ناو دۆزەخیان بۆ بگێڕنەوە، بەشێوەیەک هەردەم لە دۆخی ترس لە شتەکاندا بژیت، فۆبیای ترس، فۆبیای ئەو ژوورە داخراوانەی هەر لە ناویدا گوو و میز دەکەیت، ناتوانم ئەوی بەژنەکەی محەمەد جەمیل سوێرکییان کرد لە بیر خۆم بەرمەوە، چۆن لە ژێر دەستیان دەرهێنا و دوای ئەوەی ئەمیان بەتۆمەتی سیخوڕی لە زینداندا قایم کرد، بردیان بۆ مەزراکانی چێژ و خواردنەوە، هەروەها ناتوانم عەدنان محەمەد جەبارەین لە بیرگەم دەربهێنم، ئەو پارەدارە بەستەزمانەی ئەویشیان

بەتۆمەتی سیخوڕیکردن تاوانبار کرد، تاکو ئەو موڵک و ماڵەی تالآن بکەن، کە بەئارەقی نێوچەوانی لە کوێتدا پێکی هێنابوو، هەر لەبەرئەوەی هەواڵی قوربانییەکان نەگاتە دنیا چەندین شایەدحاڵیان سەربڕی، لە سەرەتای شەڕدا ئەودەمی زەلامەکانیان بەرەو بەرەکانی شەڕ بەکێش دەکرد، چەند ئافرەتیان لاقە کرد، کەچی ژنەکانی خۆشیان دەبردە ژوورە بلآوەکانی ناو مەزرا و کۆشکەکان؟

زۆریان کۆشا بۆ ئەوەی ناو و ئابڕووم تێک بشکێنن، تەنانەت دراوسێکانم سەیریان دەهاتێ (چۆن شەوان بەتەنیشت درندەیەکی تێکشکێنی مرۆیی واوە دەنوون، کە نێوی عەمار موزهر شێخە؟) هەرچەند من گەلێک لەو لاوانەم بەرداون، کە ئەوانی تر خۆشییان بەوەدا دەهاتەوە جەستەیانیان دەدین لە بەریان دەلەرزین، ئەوی مایەی سەرسوڕمان بوو سەرلەئێوارەیەکیان شتێکیان لێ شاردمەوە لە پشت دەرگەکەوە دەجوولآوە، پێم گوتن:

– ئەوە چییە لەودیو دەرگەکەوە؟

یەکیان گوتی:

– گەورەم، شتێکی وا نییە تاکو مایەی بایەخی تۆ بێت، ئەمە نەخۆشێکە لە شەماعیە هەلآتووە.

بەدەنگێکی یەکلاکەرەوەوە گوتم:

– ئەم میوانە نامۆیە چی دەکات لێرە؟ ئەمە هەواڵگرییە، یا خان جغان[٥]؟

یەکێک لە پاسەوانەکان بێ ئەوەی سڵ لە من بکاتەوە، گوتی:

– گەورەم، لە قسەکانی حاڵی نابین، هەندێک شتی گوتووە، لێکۆڵەرەکەمان وا مەزەندە دەکات مەبەستی ئاسایشی دەوڵەت بێت، قسەی زۆری لەو بابەتە، کە لێی ناگەین، لێکۆڵەر تا بەیانی مۆڵەتی داوە.. گەورەم دەتەوێت بیبینیت؟ شتی سەیری پڕ لە پێکەنین دەڵێت، لە مەتەڵ دەچن.

---

(٥) خان جغان: خانێکی گەورە بووە لە بەغدا، بەناوی جغانەوە ناونراوە، جغانی بەرەگەز تورک، سەرپەرشتیی خانەکەی کردووە. (و)

پێم گوتن هەر ئێستاکانێ بیهێنن. دەبینم لە بەرابەر لاوێکی بەلەباریکەی ڕیش تەنکدام، سەری نیمچە سێگۆشەیی و دوو گوێی زلی هەن، ملی باریک و جلەکانی ڕەشباو و چاویلکەی پزیشکیی لە چاودایە، لە تەوقی سەریەوە تا بنی پێی بەگۆشت و سیپاڵ و پێڵاوەوە لە چل کیلۆ پتر نەدەبوو، بەدڵسووتانەوە بۆی پێم گوت:

– فەرموو دانیشە.

ڕەتی کردەوە دابنیشێت، بێ ترس چاوی تێ بریبووم، بەڕاستی سەراسیمەی کردم، دیسانەوە پێم گوت لە نزیکمەوەدا بنیشێت، بەدەنگێکی هەڵوەریوەوە چون لەگەڵ چۆلەکەیەک، یاخۆ مێروولەیەکدا بدوێت، گوتی:

– هەیە کەر لە قەفەسێکی بچووکدا دادەنێت، کە لەگەڵ قەبارەی کەرەکەدا ناگونجێت، هەیشە قەفەسێکی گەورە دێنێت، کەچی کەرەکەی بیر دەچێت.. ژیان زۆر ئاڵۆزە، کەچی مرۆڤەکان بەخۆشەویستییەکی گەورەوە دەیگوزەرێنن.. گەمژەیی کوتاڵێکە دەکرێت لە بازاڕی ڕەشدا بفرۆشرێت.

خەریکبوو لە قاقای پێکەنین بدەم، بەدەم زەردەخەنەوە پرسیم:

– شۆخیم لەگەڵدا دەکەیت کوڕی باش؟ دەزانی تۆ لە کوێیت؟ پێیان نەگوتیت تۆ بۆ لێرەیت؟ ناوی سێییت چییە؟

بەهێمنییەوە گوتی:

– من ناوی سیانیم نییە، من تەنیا ناوم خزەیر مێرییە، من گاڵتە ناکەم و شۆخییش نازانم، لێ کێشان بەپشتەملدا شوورەییە و تەنیا بۆ کەر شیاوە.

دوای ئەوەی دانیشت، جگەرەیەکم پێ دا، بەچێژێکی ڕاستەقینەوە دەیکێشا، لێم پرسی:

– تۆ تاوانباری، یاخۆ بێتاوان؟

بەپەلە گوتی:

– تاوانبار بەچی و بێتاوان لە چ شتێک؟ ئەی نابێت ئێوە تاوانەکە بڵێن، تاکو قەبارەی تاوانەکەم بزانم؟ من لە قەحپەخانەوە هاتووم، هەینێ بەریشم

بدەن دەگەڕێمەوە هەمان شوێن.

سەرنجێکی ئەو پاسەوانەم دا، کە هێنابووی:

- ئەمە تاوانەکەی چییە؟

پاسەوانەکە بەدەنگێکی تژی لە گێلێتییەوە گوتی:

- گەورەم، تاوانەکەی لەسەر مێزی لێکۆڵەرە، سبەینێ بەخۆت دەیزانی.

لەو کاتەدا گوێم لەم ڕەقەڵەیە بوو لە شوێنەکەی خۆی ڕابوو و گوتی:

- مەولانا شانۆگەرییەکە پێویستی بەیەکێکە تەماشای بکات، شانۆش چۆڵ و هۆڵە مەولانا، مەولانا بۆ نەچینەوە بۆ ماڵ؟ لەوێ یەکێک ڕوحم (دەلێسێتەوە) و منیش بەڕێگەوەم بەرەو ئەوێ، من تاوانبارم لە بەردەم ئەو مێرووولەیەی بەر لە دوو ساڵ فلیقم کردەوە، دەبێت ئەو شوێنەی پێی لەسەر دادەنێین باش تەماشای بکەین، نەکو بێتاوانی پتر بکوژین.

نەمزانی چۆن لەو کاتەدا پاسەوانەکە جورئەتی کرد و کێبڵەکەی هەڵبڕی و چۆن ویستی لەم شێتە بدات، بێ ئەوەی فەرمانم پێ دابێت، یاخۆ ئاماژەم بۆ کردبێت؟ لەوەش سەیر و سەمەرەتر کابرای لەڕ و لاواز وێڕای ئەوەی سەرنجی پاسەوانەکان ترس و تۆقینەکەیان زێتر کرد، کەچی ئینجاش لە جێگەی خۆی نەجوولا، پێم گوتن:

- تا بەیانی لێی گەڕێن، لێکۆڵەر دەبینم و لەوەوە دەزانم چۆن و بۆچی کابرایەکی نەخۆش و هیلاکی وەک ئەمەتان گرتووە و بۆچی بۆ دەزگاتان هێناوە.. ئەم شوێنە بۆ کەسێکی نەخۆش ناشێت، چونکە لەوانەیە لە هەر ساتێکدا بمرێت.

سۆسەی ئەوەم کرد پاسەوانەکان تامەزرۆی دارکاری کردنین، لێ من پاش ئەوەی هەندێک خواردن و جگەرە و بوتڵێک ئاو و پەقرەجێکم بۆ مێزکردنی شەوی جێ هێشت، دەرگەکەم لەسەر کڵۆم کرد و لە ترسی ئارەزوو هەڵسانی شەویان و حەزی خوێڕییانەیان بۆ ڕابواردن بەوەی لەوانی تر تۆقیوترە، کلیلەکەم لای خۆم هەڵگرت.

بەر لەوەی شوێنەکەی جێ هێڵێت، پێم گوت:

- شەوت شاد مێری.

دەمودەست گوتی:

- چما هیچ شادی دەبینین؟

## محەمەد جەمیل سوێرکی

لەو دۆزەخـەدا، دڵنیا بووم، کە پەروەردگار وازی لە عێراق هێناوە و ئاوڕی لێ نەداتەوە، ئەوی من بینیم لە ستەم و کەوڵکردن و دەستدرێژیکردنە سەر ڕوح و جەستە لە ئاوەز بەدەرە، مەگەر بەپەرجوو لەو داڵانە دەرچیت، هی وا هەبوو لە قرچەی گەرمای هاویندا جارێک بەبەر خۆرەوە و جارێکیش لە ژێرزەمینە شێدارەکاندا کەوڵیان دەکرد و جێیان دەهێشت بۆ مێش و مەگەز و خشۆکەکان، بەدەیان قوربانیی وام بینی، وەلێ محەمەد ئیدریسیی شاعیر هەر لە یادەوەریمدا دەمێنێتەوە، بڕوام نەدەکرد شاعیرانیش (ئەو بوونەوەرانەی لەگەڵ شنەبا و پەپوولە و بەهاردا لە پێکەوە هەڵکردندان) بتوانن بچنە ئەم تاریکاییە تۆقێنەرەوە، فەرمانڕەوایان چ سوودێک لە شاعیران دەبینن، پرسیارم لێ کرد، بگرە لێی پاڕامەوە باسی هەندێک لە گەشتەکەی بکات بۆ ئەم ژێرزەمینە، کە تژییە لە تۆقاندن و لاشەی تێکچوو، کەچی مەینەتی دایگرت و زاری هەڵنەهێنایەوە، ڕەنگە لە من ترسابێت، ژیانمان لە نێوان مردن و ماڵوێرانیدا بوو، دواتر کاولکاری و برسیەتی، تێربووین لە قامچی و سەرشۆڕی و گاڵتەجاڕیی سەگە هارەکان.

سەرلەئێوارەیەکیان سەرهاتی خۆی بۆ گێڕامەوە، ئەگەر لەو دۆزەخە لەگەڵیدا نەبوایام بڕوام پێ نەدەکرد، بەدەنگێکی کز و بەستەزمانانەی ژێر قامچی و کێبڵ و جوێنەوە گوتی:

- ئیشەکەم لە ڕێگەی تەلەفۆنەوە لەگەڵیاندا دەستی پێ کرد، دەنگی ئافرەتێکی عێراقی نازانم لە کوێوە ژمارەکەمی دەست کەوتبوو، زانیم ژنی کابرایەکە ناوی (حەنەفی)یە خاوەنی ئوتێلی (نادر)ـە و بەشیری کوڕم لای کار دەکات و سێ سەد دیناری ئەوی لایە، ژنە گوتی بەخۆی پارەکە دەدات، لە

بەغدا پێی ڕاگەیاندم: حەنەفی لە بەڕێوەبەرایەتیی نیشتەجێکردن ڕاگیراوە و ئەم ئامادەبوونەکەمی پێ دەڵێت، تەنانەت گەلێک ئازووقەم بۆ هێنا، کە لە سۆنگەی شەڕ و دواتریش، لە بەغدا کەم بوو، لای ئوتێلەکە هەستم کرد دوو زەلام لێم نزیک دەکەونەوە، یەکیان هاتە لامەوە و گوتی لای ژنە خاوەن ئوتێلەکە ئیش دەکات و دەبێت بچین بۆ مالیان، وێڕای گومان و دوودلی هەستم کرد ناچارم سواری ئۆتۆمۆبێلە (تۆیۆتا)کەیان ببم، کە بردمی بۆ کوێ؟ بێگومان نازانم، لە ڕێگە یەکیان پرسیاری بارودۆخی شاعیرانی لێ کردم، گوتی بەخۆیشی شاعیرە، هەینێ پرسیاری ناوەکەیم لێ کرد، تەنیا ئەوەندەی گوت:

- من شاعیرێکی میللیم.

هەروەها گوتی، شیعری (لەگەڵمدا) لە فیستیڤالی هێزە میللییەکاندا خوێندووەتەوە. ئینجا بۆم ڕوون بووەوە کەوتوومەتە داوەوە، چونکە من هیچ کات لە فیستیڤالی لەو بابەتەدا شیعرم نەخوێندووەتەوە، داوام کرد لە ئۆتۆمۆبێلەکە دامبەزێنن، کەچی بەشێوە ڕەقی و توندییەکەوە گوتی:

- پێنج خولەکێک لە نیشتەجێکردن دەمانەوێت..

تەلاری بەڕێوەبەرایەتیی نیشتەجێکردن قەلایەکە لە قەلا سەخت و تۆقێنەرەکانی هەوالگری، سەرجەم کارمەندەکانی تکریتین، کۆشام هێمنییەکەم بپارێزم و ژیرانە بجوولێمەوە، چون کەسێک بێتە عێراقەوە و خۆی لە کەوتنە بچووکترین هەڵە بپارێزێت، چونکە لێروکانە هەڵەی بچووک مانای مردن دەگەیەنێت، پلە و پایەی ئەو کەسە هەرچییەک بێت کەس دادی نادات، ئەگەر بەعسییش بێت.

چیت بۆ باس بکەم، لە پرسگە جێیان هێشتم و بەتیلەی چاو ئاماژەیان کرد (ئەمە بۆ ئێوەیە)، ئیتر من کەوتمە ژێر بەزەیی ئەو سەرنجانەی خەریکبوون بەتەواوی جەستەمیان کون دەکرد، نزیکەی کاژێرێک لەوی هێشتمیانەوە، تاوێک دادەنیشتم و تاوێکی تر دەهاتم و دەچووم، جگەرەیەکم پێ کرد،

سەرنجەکانیان پێیان ڕاگەیاندم جگەرە قەدەغەیە.. پاش ئەوەی کاژێرێکی تریشم لە شوێنەکەی خۆمدا بەسەر برد، ترس و دڵەڕاوکێ دایان گرتم، ئافرەتێکم بینی بەعەبایەکی ڕەشەوە خۆی بەژووردا کرد و بەئەنقەست بەبەردەمی مندا تێپەڕی و چووە ئاسانسێرەکەوە، پاشان بۆم دەرکەوت ئەمە ئوم نادرە، ئینجا بەیەکجاری بۆم ڕوونبووەوە بەتەڵەوە بوومە و دەرەتانی قوتاربوونم نییە، چەند خولەکێکی نەبرد دوو کەسەکە هاتنەوە و بەرەو ئۆتۆمۆبێلە تۆیۆتاکەیان پەلکێش کردم و پرسیاری پاسپۆرتەکەیان لێ کردم، پێم گوتن لە ناو ئۆتۆمۆبێلەکەم دایە لە گەڕەکی عامریە، بەرەو ئەوێ کەوتینە ڕێ، یەکیان چەمەدانەکەی هێنام، کە پاسپۆرتەکەم و سەفتەیەک دیناری ئوردنیی تێدا بوو، هەروەها زۆر لەوانەش گرینگتری تێدا بوو، مەبەستم ئەو هۆنراوانەن، کە لەبەریانم نەگرتوونەتەوە، تەنیا دانەیەکم هەن و هیچیشیانم لەبەر نین. جلە شڕەکانم نەبێت، چی لە ناو چەمەدانەکەدا بوو پێچایانەوە و بردیان.

لە گەڕەکی مەنسوور نزیک بووینەوە، کە جوانترین و دەوڵەمەندترین گەڕەکی بەغدایە، یەکیان بەتوندی و بەبێڕێزی سەری داگرتم، نەکو ئەو شوێنەی بۆی دەچین ببینم، پاشان منیان ڕادەستی زەلامێک کرد و لەسەر کاغەزێک واژۆی کرد، بەتیزەمجاڕییەوە بەخێرهاتنی کردم (شاعیری بەڕێز من دەتناسم)، ئینجا بەزمانێکی زبرترەوە گوتی:

– گوێ ڕادێرە ئەی شاعیرە بەڕێزەکەمان، تۆ لێرە هیچ ناوێکت نییە و ژمارە ٨٦٤ هەڵدەگریت، دەبێت باشت لەبەر بێت، لێرە هەمووان ژمارەن.. تەنیا ژمارە و بەس.

لێم پرسی: ئایا من لێرەدا دەستبەسەرم، باشە بۆ؟

گوتی: بەڵێ، ئەوەی هێناتی دەزانێت بۆ، ئیتر لەم ساتەوە هیچ پرسیارێک مەکە.

لە مێشکی خۆمدا گوتم: ئەمەیە دۆزەخ و خراپترین چارەنووس، ئەمە ئەو

کوشتارگەیەیە هەردەم باسیان بۆ دەکردم و ئاگەداریان دەکردمەوە لێی، کەچی من بڕوام پێ نەدەکردن..

چون یەکێک وڕێنە بکات، گوتم:

– ئەمە ناندێنەکەیە، ئا لێرەش سەربڕین و دواتر کەوڵکردن و پارچە پارچەکردن دێت، دەرچوون لەم شوێنەدا کاری نەکردەیە.

بەپەڕۆیەکی تەڕی ڕەش چاویان شەتەکدام و دەستیان گرتم و بەرەو ڕێگەیەکی پێچاوپێچیان بردم، جارێک سەردەکەوتم و جارێکیش دادەبەزیم، پاشان وەستاندمیان و پەڕۆکەیان لابرد، خۆم لە ناو زیندانێکی لە قوڕ چێکراوی تاکەکەسیدا بینییەوە، وەکو مەڕ بەرەو ژوورەوە دەڵەکیان دام، زیندانێکی تا بڵێی تەنگ، تەنانەت جێی نیو کەسی تێدا نەدەبووەوە، سەرم دانەواند، میچەکەی لە دەرگەکە بەرزتر نەبوو، ڕووبەری شوێنەکە لە مەتر و نیوێکی دووجا پتر نەبوو، دەرگەکەیان بەسورگی داخست و ژوورەکە تەواو تاریک بوو، دەستم بەدیوارەکاندا دەخشاند و بیرم دەکردەوە (چۆن داهێنان لە ڕیسواکردنی مرۆڤدا دەکەن؟) دەبێ ئەمانە لە تیرەی مرۆڤ بن؟ داخۆ ئەوانیش وەک ئێمە دڵیان خۆش دەبێت و ئێمە ئاسا خەم دەخۆن؟ دەبێت چۆن مامەڵە لەگەڵ ژن و منداڵەکانیاندا بکەن؟ ئەمانە لە چی دروست کراون؟.

تا ملم لە دەریای بۆن بۆگەنی چەقیوم، کە هالاوی لەم ژوورەوە هەڵدەستێت منیان تێ فڕێداوە، بۆنی شتێک دەکەم لە بۆنی خەردەل و پاشماوەی ڕیخۆڵکەی ئاژەڵ دەچێت، تەنانەت ئەو دیوارەی خۆم داوەتە پاڵ بۆنی گوو و میزی لێ دێت، بۆنی بۆگەنییەک درێژ دەبێتەوە بۆ دەیان ساڵ، پاشان کیسەیەکم دۆزییەوە پڕی لە شتی ڕەق بوو، وام زانی بەردە، شەکەت و ماندوو و تەواو ڕووخا بووم، هەستم بەوە نەدەکرد لە ژێرمدا بوو ئەگەر بزماریش بێت، دواتر زانیم ئەوی لەسەری دانیشتوومە نانە ڕەقە، نازانم چۆن هەینێ لەو دۆخەدا بووم خەو شالاوی بۆ هێنام، وێڕای ئەو ترس و سامەی دای گرتبووم، تا سپێدەی ڕۆژی داهاتوو لێی نووستم، لەسەر ژمارەکەم ٨٦٤ بێدار بوومەوە، لەگەڵ ڕیزێک جوێن و شیرە شیرڕدا بەو ژمارەیەی نالێت (بەڵێ) و

بەو دەرگەیەدا ناکێشێت، کە لەودیویەوە دەمرێت.

پاسەوانەکە دوای ئاهەنگی پێ وەڕین و هەڕەشە لێ کردن، کە ئەو کاتی ناوی ژمارەکەی هێنام ولامم نەداوە، ڕایکێشام و بەچاو بەستراوی بەرەو سەرەوە بردمی، لەو کاتەدا من لە ترساندا خۆم گرمۆڵە کردبوو، پاشان چەند پلیکانێک دایگرتم، من دڵنیابووم هێشتا لە نزیک ژوورەکەمم، لێ ئەو سەرکەوتن و دابەزینە بۆ ڕێبزری و ئارام لەبەربڕین بوو، دوای ئەم گەمە گەمژانەیە وەستاندمی و گوتی:

- سەرت بەرەو دیوارەکە بسووڕێنە.

منیش وام کرد، ئینجا زیاد لە نیو کاژێر جێی هێشتم و بەئەنقەست خۆی ون کرد، تاکو هەلی ئەوەم بداتێ ڕووپۆشەکە لەسەر ڕووم لابەم و ئەو شوێنەی تێیدام ببینم، ئەوە کردارێکی زگماکییە مرۆڤ لە کاتی ترس و بیمدا دەورویەرەکەی بپشکنێت، لە ژێر ڕێژنەی تۆقیندا لایەک لە پەڕۆکەم لادا، دەبینم لەسەر چەند دڵۆپە خوێنێک دانیشتووم بەشێوازێکی ساویلکانەی ئاشکرا جێیان هێشتبوو، تاکو پتر لێیان بترسم..

پەنجەم بەدڵۆپە خوێنەکاندا ساوی، بۆم دەرکەوت (میکرۆکرۆم)ـە، ئیتر دڵنیا بووم ئەوی لەگەڵمدا کردیان جگە لە شێوازێکی نزم و هەرزانی تۆقاندن چی تر نییە (ئەوان بۆ هەر میوانێک شمشێری ترس بەرەو دەمارەکانی ئاوەزی ڕادەوەشێنن، بەجۆرێک وای لێ دەکەن نەزانێت کامە ڕاستییە و کامە خەیاڵ).

پاشان پاسەوانەکە بردمیە ژوورێکەوە و لەسەر کورسییەکی ڕەش ئاماڵ دای نیشاندم، دوای ئەوەی بەئەنقەست شەتەکدانی پەڕۆ تەڕەکەی بان چاومی پشتگوێ خست، لەو کاتەدا پاسپۆرتەکەی خۆمم لەسەر مێزە پانەکەی لە تەختەیەکی خراپ چێ کرابوو، بینی، سەرم هەڵبڕی، چارەی لێکۆڵەرەکەم بینی، کە زانی پەڕۆکە لە شوێنی ڕاستەقینەی خۆیدا نییە، لە ناکاو زللەیەکی تێ سرەواندم و ئەوپەڕۆیەی ئازاری دەدام، گەڕاندەوە جێگەی خۆی و کەوتمە

تاریکییەکی ئەنگوستەچاوەوە، بەڕوونی گوێم لە دەنگی پاڕانەوەو بەزەیی پێداهاتنەوە و نرکە و ناڵە و هاوار و ئازار و گریان بوو، لێکۆڵەرەکە بەئەنقەست لێم گەڕا تا گوێم لێ بێت، ئینجا سەری بەلای مندا وەرسووڕاند و بەر لەوەی لەگەڵمدا بدوێت گوێم لە ویزەی کامیرە بوو، وادیاربوو گشت شتێکی تۆمار دەکرد و وەکو بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوە دەیدا بەگەورەکانی، گوتی:

– دەزانیت تۆ لە هەواڵگریی عێراقیت؟

وەک ئەوەی شەیتان لەبری من هاتبێتە وەڵام، دەمودەست گوتم:

– بەداخەوە.

بەتووڕەیییەوە گوتی:

– بۆ بەداخەوە؟ تۆ بەختیاریت، چونکە لە زیندانێکدایت کەس پێی تێ نەناوە، جگە لە گەورەکانی وەک شەفیق کەمالیی شاعیر و مونیف ڕەزاز، بەڵکو بەڕێوەبەری هەواڵگری بەخۆی تێیدا بوو هەینێ سەرۆکی فەرماندە لێی تووڕە بوو، ئەم زیندانە زانا و شاعیر و فەیلەسووفان سەردانیان کردووە، تەنانەت خۆمیش ماوەیەکم تێدا بەسەر برد و نزیکترین کەس لە سەرۆکەوە دە ڕۆژ تێیدا نووست، تۆ دەبێت بۆ ئەم ناز و نیعمەتە منەتباری خوا بیت.

کاتێک بیرم کردەوە و ویستم شتێک لەبارەی ئەو (ناز و نیعمەت)ـەوە بڵێم، بەسەرمدا شیراندی قسان نەکەم، من تاوانبارکراوم بەوەی بەقاچاخ خەڵکانێک بۆ عێراق دێنم، ئەمەش تاوانێکە سزاکەی لە دە ساڵ زیندانی زیاترە، بەبڕوا بەخۆبوونێکەوە گوتی:

– شایەدیشمان لەسەرت هەیە.. شایەدی چەور.

بیرڕۆیییەکی سەیر دای گرتم و هەڵیدامە شوێنێکی تر، قسەکانی لێتۆژەرەکەم نەدەبیستن، بیرم لەو ساڵانە دەکردەوە، کە لە دەرەوەی ماڵ و خێزان و نیشتمانەکەمدا دەیگوزەرێنم، لێتۆژەرەکە بەتوندی تاکێک پێڵاوی بەبن گوێمدا کێشا، بەر لەوەی لە دەستی لێدانەکەی ئۆف بکەم، پێڵاوی

دووەمی پێدا ماڵیم و شیڕاندی بەسەرمدا:

- چی دەکەیت ئێمە پێی دەزانین، هەی نەگریس.

هەینێ نکوولێم لە تۆمەتەکە کرد، دووبارەی کردەوە:

- دانپێدانانەکەت کۆتایی بەکۆژانەکانت دێنێت، دەرفەتێکت دەدەمێ بۆ بیرکردنەوە، تاکو کاژێر چواری سبەی، بیرت نەچێت من لەگەڵتدا میهرەبانم، چونکە شاعیریت.

بەپێلاو لێم دەدا و پێم دەڵێت لەگەڵتدا بەبەزەییم، هاوار بۆ تۆ خوایە، داخۆ ئەگەر تا ئەم ڕادەیە میهرەبانیم لە بەرابەردا نەنوێنێت چی لێ دەکردم؟

ئێمە، ئەمجاریان پاسەوانەکە بردمی بۆ زیندانێک سێ دەستبەسەری تێدا بوون، دوای ماوەیەکی کەم ناوی هەرسێکیانم زانی، ئەمە ئەبوعەبدولحەکیم زەوبەعییە لە هۆزی زەوبەعە، دووەمیشیان سوورییە لە شاری حەلەب، سێیەمیش هەر بەیەکجا زەندەقی چوو بوو، ناوی (علێوی) بوو، پاشماوەی ناوەکەیت پێ نالێم.

زەوبەعی تفەنگێکی کڕیبوو، ئاشکرابووبوو، کە لە گاردی کۆماری دزراوە، جا بێنەی بەرچاوی خۆت: تفەنگ بێ و لە گاردی کۆمارییش دزرابێت (!).

هەرچی کوڕە لاوە حەلەبییەکە بوو، پاش هەلاتنی لە سووریا، بەپێیانی خۆی هاتبوو و خۆی ڕادەستیان کردبوو، هەواڵگریی ئەوێ بۆی دەرکەوتبوو سەر بەعێراقە، هەرچی علێوی بوو برادەرێکی بڕێک پارەی لا دانابوو، دەرکەوتبوو پارەی قەڵبن.

کاتی نیوەڕۆ لەو شوێنە نەفرەتییەدا دژوارترین شت بوو لە ژیانمدا بەڕێم کردبێت، ئەوە کاتی ئەشکەنجەدان بوو، کە پێیان دەگوت (لێکۆڵینەوە) گەڕانەوەش لێی بەشکاندی پەراسوویەک، یاخۆ داخکردنی جیا جیا، یانیش شکاندنی چەند ددانێک کۆتایی دێت، لەو لێکۆڵینەوەیەدا هیچ نەبێت تێرت دەکوتن، ئیتر جەلادەکە بەکەیفی دڵی خۆی شوێنێک لە جەستەت هەڵدەبژێرێت، ئای چ پێ ڕابواردنێکە، هەست دەکەیت چێژ دەڕژێتە سەر

مـەیدانی شـەڕێکی یەک لایەنە، پیاوێک دەکـوتێ و یەکیش لێی دەدرێ و هیچ دەسەڵاتێکی نییە، ڕەنگە خراپترین شتێک بیکەن هەڵواسینی زەلامەکەیە وەک مـەڕی سـەربڕاو بـەدیوارەوە، لەگـەڵ بۆ دواوە شـەتـەکـدانی شـانەکـانـێـتی بەشـێـوەیەک لە شـوێنی خـۆیان دەرچن، ئینجـاش بـەربوونە گـیـانی بەدار و کوتەک و کێبڵ، تەنیا ئەوەندە دەبیستی دەڵێن:

– ها سەگە؟ دانی پێدا دەنێیت؟

لە کۆتاییدا هـەمووان دان بەوەدا دەنێن، کە نەیان کردووە، چونکە جەستەی مرۆڤ بۆ ئەوە نەخوڵقاوە، تاکو بەم کەمتـەرخـەمی و دڵڕەقییە ڕیسـوا بکرێت، کـە لە دڕندەیی گـورگ و کـەمـتـیـاریشی تێ پەڕاندووە.. بەم ئاوایە لەگـەڵ دەوروبەرەکـەم سـازام، بەمـۆچیـارییـەکـانی کـابرای زەوبەعی دڵخـۆش بووم، هەینێ پێی گوتم دان بەشتەکاندا بنێم، لێم پرسی:

– چۆن دان بەشتێکدا بنێم نەمکردووە؟

گـوتی: لێرە دان بەشـتـەکـاندا بنێ، هـەینێ بۆ لای دادوەرت دەبـەن پێی بڵێ، تۆ لە ژێر پاڵەپەستۆی ئەشکەنجەداندا درکاندووتە.

بەکـۆمـەڵ ئەسـپێ بەسـەر گـیـانماندا دەخـشـان، ئەسـپێش لە شـوێنی وادا قـەبارە و شێوەی جیـا جیـایان هەن، لێرە پـەخـشـە و مێشـوولە و گەلێک لەو بوونـەوەرانەی بـەمـایکرۆسکۆپ نەبێت نابینرێن، پێـوەیان دەداین و نەمـان دەبینین، گشت ئەمانە یارمەتییان دەدان، تاکو خێرا دان بەشتـەکاندا بنێین، بەڵکو لەم بەلا گـەورەیە دەرچین، هەمـوو ئەمـانەش لە سـۆنگەی ئوم نادرەوە ڕوویان دا، کە پیلانی دژی مێردەکەی گێڕا، هەتا دەست بەسەر مـوڵک و ماڵی پیـاوەکـەیدا بگرێت و بـەشی منیش ئـەو داوە بوو تـێی کـەوتم، من بێ هـیچ تاوانێک لە ئاهەنگی ئەشکەنجـەدانەوە بۆ ئاهـەنگێکی تر، ئەوەتانێ من وا لە بەردەمـتدام، ئەمـەش دوای هێنان و بردنێکی زۆر لە گـۆشـەی گـرتیگەکـاندا، نازانم سـبـەینێ چارەنووسم بەکـوێ دەگـات، چونکە کـاتێک تۆ لە بەردەم دڕندەیێلێک بیت جلی مرۆڤـیـان پۆشـیـبێت، مـەگەر بەپەرجـوویەک لە خـواوە،

ئەگینا ئەستەمە لە چڕنووک و کەڵبەیان قوتاربیت و ناتوانیت نوقڵانەی هیچ شتێک لێ بدەیت(*).

(*) ئەم بەشە بەدەستکارییەوە لە کتێبی (زیندانی ژمارە ٨)ی (محەمەد ئیدریسی)ی شاعیر خۆیەوە وەرگیراوە. (نووسەر)

## عەمار موزهر شێخ

هێند شتی سەیر و سەمەرە دەبیستم خەریکە بڕوایان پێ نەکەم، سەرەنجام محەمەد ئیدریسیی شاعیریشیان بەردا، گەمەیەک لە ناو قەلاکەی سەرۆکدا بەڕێوە دەچێت، لە خۆی بترازێت کەس پەی پێ نابات، چونکە هەرگیز ئەقڵ نایگرێت ئاوا بەئاسانی دەست لە جۆرە کەسایەتییەک بەردەن کەوا هەموو جۆرەکانی ئەشکەنجەیەک، کە لە ناو ژێرزەوییە تایبەتییەکانی بەغدا و ماڵەکاندا بەکار دەهێنرێت چەشتوونی، بەجۆرێک کە هەر کەسێک بەختی ڕەشی پەستایە پشت دیوارەکانیانەوە، ئیتر گوێی تەنیا بەناڵە و هاواری سەربڕاوان پڕ دەبێتەوە و ئەو قوربانییانەی، کە هەزارەها تف و نەفرەت لەو ڕۆژە ڕەشە دەکەن، کە تێیدا پێیان نایە ناو ئەم دنیایەوە، دەبێت چ نهێنییەک لە پشت ئەم گەمە نەزانراوەوە خۆی مەلاس دابێت؟

ئەمە شتێکە ئاوەزم قبووڵی ناکات، لە کاتێکدا ئەو بوونەوەرە بەردینانەی کار لە کەوڵکردنی (سیخوڕەکان) دەکەن هێشتا لەگەڵ ئەوانەدا ڕادەبوێرن، چاوەڕوانی یاریی ئەو دەسەڵاتدارەن، کە بەپێی زەوقی خێڵەکیی خۆی فەرمانڕەوایی وڵات دەکات و نازانێت چی لەم دەوێت و بۆچی ئەوی تر بەر چەقۆ دەدات؟ منیش لەم بوونەوەرە (هەڵانە) بەدەر نیم، مادامەکی لەگەڵ ترسەکەمدا لەم هەوەسە تاکەکەسییەدا دەژیم، کە ناکرێت بدۆزرێتەوە، یاخۆ پێشبینی بکرێت، دوور نییە لە ناکاوێکدا بەرەو ئاسیاوەکە دەڕۆیت بێ ئەوەی بزانیت ئەو تۆمەتەی پێتیانەوە لکاندووە، چییە، کەچی تۆ خۆت ئەو نۆکەرە سەرشۆڕە گوێڕایەڵەیت، کە سڵ ناکاتەوە لە سەردانەواندن و چەمینەوە بۆ ئەوانەی لە خۆی پلەدارتر و پایەدارترن. من بەلای ئەوانەوە لە سەگێکی بەزنجیر بەستراو زیاتر نیم، سەگێک دەخوا و دەخواتەوە و دەنوێت، هەینێ

فەرمانی خواردن و خواردنەوە و نووستنی دەدەنێ، یاخۆ فەرمانی پێ دەدەن لەگەڵیاندا گەشت بۆ سەرتاپای دنیا بکات، تاکو گوێڕایەڵی و بەسەگبوون و بێدەنگیی لە بەرابەر ئەو تاوانانەی ڕۆژانە دەیانبینێت، پتر بێت.

مووچوڕکە بەدڵداهاتن هەرگیز لێم نابێتەوە، تەنانەت ئەو کاتی لە ئامێزی ژنەکەشمدام، بۆشاییيە لە ڕوحدا، هەرجارێک هەست بکەم یەکێکم لە (ئەوان) خەریکە دەرشێمەوە.

قێز لێ هاتنەوەیەک لە نێوان پەراسووەکانمدا خۆی مەلاس داوە، کاتێک ورگیان دەبینم لە بەردەمیاندا شۆڕ دەبێتەوە، لە ژاپۆن سەربڕینیان لەسەر شێوازی سامورای فێرکردم، چۆن (ئەوی دەیانەوێت بیکوژن) بکەمە دوو لەتەوە، ئەمجاریان بەشیر، دەستپێک هەفتەیەک مۆڵەتیان دام بۆ ڕاهێنان لەسەر پارچە پارچەکردنی سەگ و پشیلە، تاکو دوای ئەوە سەربڕینی خەڵک، یان برینی جەستەیان لە ڕاستی سکەوە بۆ لای چەپ، بەمەرجێک برینەکەی لە سێ چرکە زیاتر نەبات، چواریش ئەگەر قەبارەی زەلامەکە چەند کیلۆیەک لە (تاوانکاران)ی تر زێتر بێت.

لە ڕۆماش فێری جۆرێکی تر لە کوشتن بووم، ئەوەندە بەسە بەکوتەک بەپشتەسەریدا بکێشیت، لەو شوێنەی کەللەسەر، کە بۆیان دەستنیشان کردم، تاکو قوربانییەکە دوای نیو کاژێر لە ئازارێکدا وەسف ناکرێت، بمرێت. خۆ ئەگەر بەهەڵە لە شوێنێکی تری سەریم دا، ئەوا دەمودەست بێ ئازار چەشتن گیان لەدەست دەدات، ئەمەش دەمخاتە ژێر باری پرسیار و گومان لێکردنەوە، ئا لەو کاتەدا هەستم کرد مانەوە لەگەڵیاندا ئەستەمە، حەزێکی گوناهکارانە هەیە بۆ کوشتنی زۆرترین ڕێژەی مرۆڤ (لەبەر چی؟)، چون لەو ڕۆژە بترسن تێیدا باجی کوشتن و برینەکانیان دەدەنەوە و هیچ چارەیەکیان نەبێت جگە لە خۆقوتارکردن لەو تارماییيەی لە پەرجوویەکدا دێت و تووڕیان هەڵدەداتە لەناوچوونەوە. کات لای ئەوان هیچ نرخێکی نییە، بوونەوەرێکی ڕەنگزەردی دەردەژۆی مردوو ئاسایە، زۆر بەخوێنساردییەوە مرۆڤەکان دەکوژن، لام وایە چێژ لە دیتنی ئەو لاشانە دەبینن، کە یەکسەر هەناسەیان لەبەر دەبڕێت.

- گوێ بگرە هەی بەدفەساڵ، تۆ لە بەردەم عەمار شێخدایت، ئەو بڕیار لەسەر چارەنووست دەدات، هەی ناپاکی چەپەڵ.

منیش لە ترسی ئەوەی ئابڕووم نەچێت لێوی خۆم دەگەست، هەندێک جار چۆکم دەشکا و لەو ساتە هەترەشم چووبوو، کە نهێنییەکەم ئاشکرا بێت، سیمای ڕوح شپرزەیی و بێ ئارامییەکی گەورەیان ڕادەگەیاند، زەحمەت بوو بشارڕێتەوە، یاخۆ ڕۆڵی پیاوکوژێکی تۆقێنەر بنوێنرێت، تەنانەت لە بەردەم بچووکترینیشیان بێت، ئەو دۆخە زراوی بردبووم، کاتێک نیگاکانیانم بەدی دەکرد، (گومان)م بەئاشکرا لە چاویاندا دەبینی و پێویستی بەپرسیار نەدەکرد، ئەوان عەمار موزهر شێخ لە من باشتر دەناسن، هەیشە ڕاپۆرتم لەسەر دەنووسێت.

***

لە ژوورێکی لاچەپی تایبەت بەئەشکەنجەدان شێتێکیان بۆم هێنا، گوتیان بەناوی (کوڕی بەرپرسێک)ەوە لە دار دەدرێت، کوڕەش نێرراوە بۆ لبنان و لەوێشەوە بۆ قوبرس، کەچی ئەو شێتەش بەلەقەنارەدان دەمرێت و لە شوێنێکی دووردا دەنێژرێت، پێم گوتن:

- چی لەم شێتە بکەم؟

گوتیان: تۆ گەواهی ئەوە دەدەیت، کە کوژراوەکە چووە بۆ بەیرووت، ئەمەش مانای وایە ئەوی لەسێدارە درا، هەمان ئەو کەسەیە سەرۆکی فەرماندە فەرمانی لەسەر داوە.

ئا لێرەدا هێندەی نەمابوو شەیتانی ناخم ئابڕووم بەرێت، خەریکبوو بەسەریاندا بشیرێنم، لێ سەرەنجامەکەیم دەزانی، بۆیە ناوی خۆم نووسی و لەسەر کاغەزەکە واژۆم کرد، کە فەرمانی لەداردانی ئەو کوڕە بەرپرسەی تێدا بوو، بەکەیفی دڵی خۆی لە شەقامی زەیتووندا بەنێو کۆمەڵێک لەشفرۆشدا تەراتێنی دەکرد و چاکیش ئەوەی دەزانی یەکێکیان لەبری تاوانەکەی ئەو کوشتووە.

کوشتنی شێتان چەند بارە بووەوە و ناوی منیش لەسەر لیستی پانی خوێن دووبارە دەبووەوە، لە پێخەفەکەمدا گریام و عەفرا خوێنی سەر پەنجەکانی دەسڕیمەوە، ئەو خوێنەی ئەو کات لە پەنجەم دەهات، کە بێتاوانێکیان بۆ ملبڕەکە دەبرد، یاخۆ فڕێیان دەدایە ڕووبارەوە پاش ئەوەی دەخرایە حەوزی سیانیدەوە و لە هەوادا دەبوو بەهەڵم، ئەو کابرایەم بەبیردا هات، کە جوێنی بەکاڵەک دابوو و خەریک بوو بەدەستیانەوە بمرێت، دڵنیاش بوو ئەوی گوتبووی مەبەستی بوو، چونکە جیاوازییەکی گەورە نەبوو لە نێوان سەلکە گندۆرە و سەری فەرمانڕەوادا، هەردووکیان لە بان و لە خوارەوە (بۆگەنیان کردبوو) و دەبوو پاک بکرێن، تاکو ڕووی ڕاستەقینەیان ببینین.

خاترجەم بوون، من ئەو زەلامە نیم پێویستیان پێیەتی و بەدڵیانە، بۆیە زیاتر کەوتنە خەوشدارکردنی ناو و ئابڕووم، نەخوازەڵا لە نێوان ئەو تۆمەتبارانەی خەریکە بێتاوان دەبن، هەینێ ئەمانە ئازاد دەکرێن شتی پڕ لە سەیر و سەمەرە لەبارەی خوێنڕێژی ناودار عەمار موزهر شێخەوە دەبیستن و لە ناویاندا کەسیان بەزەییان پێمدا نایەتەوە تەنیا ئەوە نەبێت، کە جمانی بەکاڵەک دا، تەنیا ئەو ڕاستی دەزانێت، ڕاستییەکەم، لەوانەیە (مێری)یش، ئەو شێتەی دەیزانی من لەوان نیم و لە هیچ مشکێکی دارستانی هەواڵگری ناچم، بۆیە هێنامە ژوورەکەی خۆم و جگەرەیەک و فنجانێک قاوەم پێ دا، لە ئەحواڵیم پرسی، گوتی:

- سوپاس بۆ پەقرەجی میزکردنەکە، نازانم لەو ژوورەدا سەرم بەکوێوە بنایا، لە کاتێکدا من زوو زوو میز دەکەم؟

پێم گوت:

- ئایا تەنیا لەبەر سەتڵە میزەکە سوپاسم دەکەیت؟ یاخۆ دەتەوێت شتێکی ترم پێ ڕابگەیەنیت؟

سەیرێکی دەرگەی ژوورەکەی کرد و بەدەم زەردەخەنەوە گوتی:

- گەورەم.. هەیە لەوێ کەرەکە لە قەفەسێک دەبەستێتەوە لەگەڵ قەبارەی

گوێدرێژەکەدا ناگونجێت، هەیشە قەفەسێکی گەورە دێنێت، کەچی کەرەکەی بیر دەچێت.. ژیان وەکو من دەیبینم.. گوێدرێژێک شادمانە و گوێدرێژێکیش بەدبەخت.

هەستێکی نامۆ بەئارامی و تۆڵە، لەگەڵ ئەم شێتەدا لوولیان دام، کەچی پاسەوانەکان دەهاتن و دەچوون و بەسیمای پڕ لە نائومێدی و وەڕسی و چاوەدزێوە لەوەی لە (دەزگاکەیان)دا دەیکەم و بەسووکیی لێی دەڕوانم، هەینێ لەگەڵ ئەم (بەئاوەز)ـەی ناچێتە دڵیانەوە، دەئاخڤم، سیمایێلێک لە داخاندا خەریکە شەق دەبەن، لە داخی ئەم (خوێنڕێژ)ەی لەگەڵ شێتاندا دەخەنێتەوە بێ ئەوەی سروشتی پیشەکەی خۆی لە یاد مابێت، لێ من توورەم هەڵدانە پاشەڕۆکی یادەوەریمەوە و داوای چای و جگەرەم کرد و لە (مێری)م پرسی ڕاستیم پێ بڵێت، داخۆ لەم شوێنە تژی لە ترس و سامەدا هەست بەچی دەکات؟

مێری لەو دەمی سوڵتان ئاسا دووکەڵی جگەرە مارلبۆرۆکەی بەبادا دەدا، گوتی:

- سەردانەکانتان لە ڕۆیشتن بۆ سینەما و شانۆ دەکات، یاخۆ چوون بۆ ماڵە سۆزانییەکان، بمبوورە، لە گشت ئەو دۆخانەدا ترس و تاسە هەن، لێ ڕێژەکە لە نێوان شەوی ئێرە و ئەوێدا جیاوازیی هەیە، نکووڵی لێ ناکەم من لەگەڵ ئێوەماناندا هەست بەترسی زیاتر دەکەم، هەر لە سۆنگەی ئەمەشەوەیە جار بەجار بێ ئاگا میز بەخۆمدا دەکەم.. لە نێوان ئێوەدا لێکچوون لە بەینی ترساو و ترسێنەردا، ڕێگە پێ دراو و ڕێگە پێ نەدراودا نابینمەوە، گەورەم من جگە لە مێرییەکی تۆقیو میز دەکاتە بن خۆی، هیچی تر نیم، لێم گەڕێن دەرچم.

بەڕاستگۆییەوە پێم گوت:

- هەر دەبێت دەرچیت، خاترجەمبە مێری.. دەردەچیت.

***

بیرم کردەوە دەوڵەت مووچە و بەخشیش و شیرنیمان دەداتێ، تاکو پتر پێ لەسەر ئەشکەنجەدانی خەڵکی دابگرین، ئەگەر دەوڵەت بینیمی لەگەڵ ئەم شێتەدا لە وتووێژێکی خۆشدام، یەکەمین جار مووچەکەم لێ دەبڕێت، پاشان شتەکانی جەستەم دەبڕێت.. وێڕای ئەمانەش هێشتا هەستی ئاسوودەیی و تۆڵە سەرپێچیم دەکات لەوەی چایەک لەگەڵ ئەم بوونەوەرە دڵگیرەدا نۆش بکەم، کە دەڵێت:

– ئەگەر فەیلەسووفێک و جەلادێکت لە یەک ژووردا بینییەوە، مانای ئەوەیە مێژوو گاڵتە بەخۆی دەکات، ئەگەر جەلادێکیشت بەڕووتی لەگەڵ ئافرەتێکدا بینی، ئەوا مەترسێ .. مانای وایە ئەو ژنە بەو شتەی ناوگەڵی مرۆڤایەتی ڕزگار دەکات.

منیش دەخەنمەوە، نەک لەبەرئەوەی پێمی دەڵێت، بەڵکو بۆ تۆڵەسەندنەوە لە پاسەوانەکان، کە لە بەجێگەیاندنی فەرمانەکانمدا خاوە خاویان دەکرد، کاتێک داوای قاوە یا چای و ئاوی سارد و جگەرەم دەکرد، دەمزانی ئەوان هەر یەکسەر دوای ئەم میوانداریە گەمژانەیەی نێوان جەلاد و فەیلەسووف ڕاپۆرتەکەیان دەنووسن.

سەیرم لەم شێتە هات، هەینێ وا بەتامەوە قاوەکەی دەنۆشی ڕۆژێک هەستم پێ نەکردبوو، چارەنووسی خۆمم پێ ڕادەگەیەنێت:

– گەورەم تۆ خۆت دەخەیتە تالووکەوە، چونکە تۆ لەم بوونەوەرانە ناچیت، کە لەم ژێرزەمینانەدا کار دەکەن، ئامۆژگاریت دەکەم لە بەرچاو پاسەوانەکانت بەتوندی لێم بدەیت، نامەوێت لەدەستت بدەم، مەبەستم ئەوەیە نامەوێت خەڵکەکەی دوای من تۆیان لە کیس بچێت.

چوون بەڕاستی بیرم چووبێتەوە (من کێم) و ئەوانەش کێن لە ژێر دەسەڵات و فەرمانیاندا کار دەکەم، ژنەکەم و کەسوکار و برادەرەکانم بیرهاتنەوە و دڵنیا بووم زیانکردن ئەگەر دەست پێ بکات ئەوا تەنیا بەکوشتنی بەرنامە بۆ داڕێژراوی خێزانەکەم دوایی دێت. ئا لێرەدا خۆم پێ نەگیرا و بەسەر

پاسەوانەکاندا شیراندم هەر ئێستا ببیەن بۆ نەخۆشخانەی شەماعیە، ئینجا هاوارم کرد بەسەر ئەو و ئەوانی تریشدا:

– ئەمە بەڕاستی شێتە، نامانەوێت لە سۆنگەی شێتێکی واوە ڕاست و چەپی خۆی لێک ناکاتەوە تووشی کێشە ببین. کاغەزێکم بدەنێ و هەر ئێستا بۆ نەخۆشخانەی بگوازنەوە.

بەر لەوەی مێری لە شوێنەکەی خۆیدا هەستێت، لە بیلبیلەی چاوەکانیدا هەستم بەنیگای منەتباری کرد، لێ پاسەوانەکان بێ فەرمانی من بەربوونە گیانی، وەک ئەوەی تۆڵەی ئەو چایە بکەنەوە، کە بە(هاووڵاتی)یەکی ئاسایی بێ نرخیان دابێت، شایانی ئەوە نەبێت لەم مەملەکەتەی بەتۆقاندن و قامچی و سووکایەتی بنیاتیان ناوە، جگەرە بەبادا بدات، لەو لاشەوە مێریی بەستەزمان جەختی لەسەر شێتییەکەی دەکردەوە و دەیگوت:

– ئەوە منم ڕووبار بەتەلدرِ دەستگیر دەکەم، منم مێشوولەم فێر کرد چۆن ئەلف و بێ بخوێنێتەوە.

پاش ئەوەی بردیان، لە ژێر مێزەکەم چەند پارچە کاغەزێکی قەمچکراوم بینی، گومانی تێدا نییە مێری بەر لەوەی پاسەوانەکان بیبین توورِی هەڵداون.

## ئەسعەد سەعید فەرحان

وێڕای ئەو هەمـوو جوێندان و کـەوڵکردن و تێـهـەڵدان و دەسـتـدرێژیکردنانەی بینیمن، هەروەها سەرەڕای ئەو مشکانەی بەسەر جەستەمدا جرتوفرتیان بوو و ئەو سـەرەنوێلکانەی بۆ سـووکـایەتـی و گـاڵتـە پێکردن تووڕیـان هەڵدامـە سـەریان، ئینجـاش بەدرێژاییی ژیانم هێنده هەسـتـم بەم خـۆشـەویسـتـییـە سەرکێشـەم بۆ بـەغدا نەکردووە، هەر بۆمـبـایەک دەکەوتە سـەر مـاڵێکی، وام دەزانی پەراسـووی کـون دەکـردم، پێش ئەوەی شـەقـام و دەزگـەکـان وێران و خاپوور بکات و منداڵی و ژیان بسووتێنێت، هەر گوللەتۆپێک بەسەریدا تێپەڕ بوویێت، ئەوە بەسەر جەستەی مندا ڕەت بووە.

ئەو چیـا سـەرکەشـەی، کە هەورە بروسـکە شێت و هاری کـردووە، یا ئەو گـڕکـانەی هـەناوی پڕ لە ڕق و کـینە لێـیــەوە لافــاوی ئاگـر دەردەدات، هـیچ فـەرهەنگێک لەو فـەرهەنگانەی، کـە هەن هەرگـیز نایانگرێتـەوە. ڕۆژانێک لە مـەرگی خـێرا، خـۆی لە ڕوحی مرۆکـان ناگەیەنێت، دنـیـای دەوروبەریشـمـان کەلەش و ئەندامـەکانی ئیفلیجن، نە ئەموسـتـەکانی دەجـووڵێن و نە لێوەکان دێنە قسە و نەیش چاو ئەو شتـانە دەبینێت، کە ئێمە بینیمان لە سـەربڕین و کەوڵکردن و تۆقاندن، کە لە ترسی گەورەتر پێچرابوون.

ئەم ژیانەی ئێمە تێیدا دەژین زۆر سەیرە، هیچ شتێکی تێدا نییە لە شتێکە سـەرسـوڕهێنەرەکـانی ڕابردوومـان بکات، بەغدایان لە نەخشـەی گـیتـی و نەخشـەی مـانا هەڵکەند، تا ڕادەی مـەسـتـی سـەرخـۆشـیـان کـرد، لە نێـوان هەسارەکان و تەنە زەبەلاحەکانی ئاسمـاندا سووتاندیان، گەشتێکی لە ئاوەز بەدەر و زەندەقچـوونێک لە چاوترووکـانێکدا مـەوداکـان لووش دەدات، کـاتیش بەسـسـتـی تێ دەپەڕێت، خـاوترین کـاژێرەکـانی سـەردەم و لە هـەمـان کـاتدا

خێراترینیشیان.

ئەوانەی بەسەرماندا دەکەون تارمایی نین، ئەویشی دەیانبینین نە ئەندێشە و نەیش وەهمن، زریان و با و بۆران و پەرجوون، ئەو کاتی دەمبینی بەغدا دووکەڵ ئاسا پارچە پارچە دەبێت، لە مێشکی خۆمدا دەمگوت: وای لە نیشتمان، بەسووربوونەوە سەریان بڕی، دڕندەیەک دەڕوا و دڕندەیەکی تر دێت، تاوانی تۆ چییە بەغدا، تاکو بەم ئاوایە پێست و ئێسقانت بسووتێن، لە نێوان سەردەمێکی پڕ مەینەتیدا، کە بەدوای خۆیدا سەردەمێکی تر لەو پڕ کارەساتتر دێنێت؟ دوای ئەو هەموو شتانەی ڕوویان دا مێژوو چی لێت دەوێت، بەغدا، ئەی بەغدا، چاوم بەفیدای ئەو بالایەت بێت هەر دەڵێی دارخورمایە، ئاژەڵی ئاوەڕۆکان تەماعی چییان پێتە، ئەم ڕۆشناییە گەشەی سەرتاپای دنیایەکی ڕووناک کردەوە تاریکییەک دای گرتبوو سەدان ساڵ درێژەی کێشا؟ پێم گوت: بەغدا، ئەی سەوزە گیای شیعر ورووژێن، ئەی ئەو بۆنە خۆشەی سەری کاس دێنێتەوە هۆش، ئەی خۆڵی هەنیە، ئەوەتانێ لە چاوانتدا نقوم دەبم و لەسەر سینە نەرم و شلە بەسۆزەکەت دەنووم، دەروازەت لە چەشنی دەرگەی پەیامبەران ئاواڵەیە و ڕێگەکەشت بۆ خۆشەویستان و ڕوحی پەروەردگار کراوەیە.

بەڵێ، بەتاوانەکانیانەوە هەلاتن و وا بەئاسانیش نایاندۆزینەوە، تەنانەت بەکەوتنی ئەم بەرازانە خۆشییەکانمان لەودیو تێکشکانەکانیانەوە کاڵبوونەوە و جگە لە گوللە و دز و خەڵک ڕفاندن و لەملدانیان بەنوێژی نیوەڕۆ هیچ نەماوەتەوە، بۆنی شتێکی سووتاو دەکەم، هەموو ئەو مالانەی لە دەوروبەری ماڵەکەمدان، هەروەها هەر منداڵێکیش بۆ قوتوویەک شیر بگرییێت، کە لە گوانی مانگاکاندا وشکی کردووە، ئەوی لێرەدا ڕوو دەدات لە برووسکی خەیاڵ دوورتر و لە سەرووی ئەستێرەی ماقوولەوەن، ڕۆژگارێکی پەتیارەیە میللەت تێیدا شێتیی خواستووە و کوشتنیش وای لێ هاتووە بووەتە هەواڵێکی دووبارەوە بوو لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکانی دنیا، بێ ئەوەی کەس بۆی بجوولێت، یاخۆ ویژدانی بهەژێت، ئەوەتانێ ئێمە لەسەر پشکۆی عیشقدا

دەژین، لێ عاشقەکە دەمرێت، دەمانەویست ئاگری ستەم و ئاگری ستەمکار و ئاگری تاریکی دامرکێنینەوە، کەچی دەچینە تاریکاییەکی ئەنگوستەچاوەوە ئەوسەری دیار نییە و گەڕاندمانییەوە بۆ (هۆلاکۆ) و ستەمکارێک جگە لە ماسکەکەی دەموچاوی چ شتێک لەبارەی سیمایەوە نازانین. ئاگردانێک لە پانایی دەریا گەورەتر، باروت و ترس و گولالەسوورە، مێژووەکەت چەند سەیرە عێراق، لە سەختترین ڕۆژانی تەمەندا، لە لایەکەوە چەپکە گوڵ و لە لایەکی ترەوە تۆقین و ئاگرباران، گولالەسوورە لە نێوان پارچە گوللەتۆپەکاندا دەشنێتەوە و لە بەرامبەر بۆنی ئەو لاشانەی بەدرێژایی ڕووبارەکە و لە سەرەڕێگەدا فڕێدراون بۆنەکەی بڵاودەکاتەوە.. ئەوەتا جارێکی دیش دوای ئەوەی پێم نایە سەر خاکی جنۆکان ناوەکەم لەدەست دەدەم، خەونەکەم هاتە دی، کە ڕزگار دەبم لێیان، کەچی دەکەومە دۆزەخێکی ترەوە لە شێوەیەکی تر، دەنگم ستەمی لێ کراوە، دڵیشم لە هاوار کەوت، بەتەواوی لە هاوار کەوت، کاتێک گوێی لە ناڵە بوو، خەریک بوو ناڵەکان لە هەڵهەڵەی سەر ڕووی ئافرەتە تۆقیوەکان دەچوون، وێڕای ئەمانەش لەمڕۆ بەدواوە چەمەدان نییە، من لە قاووقیژی خەمەکانمدا دەمێنمەوە، بەختەوەرترین بەختەوەر لە جیهاندا و لە گشت کەسێکیش دڵخۆشتر، مادامەکی بەشێک لە ئاوە سوێرەکەی دەریا لەسەر بەغدا بوو بەهەڵم و تۆقین نەما، مەگەر هەڵەیەک لێرە و تاوانێک لەوێ، گرینگ ئەوەیە، لەمڕۆ بەدواوە کەس نازەڕێت و کەسێک نابینی دەستدرێژی بکرێتە سەر و پێ بکەنن بەقوونی پیسبووی بەتۆماوە گلاوەکەیان.

***

ئەو هەستەم لا ڕوواوە، کە ئەمین هاشم بەیتار هێشتا لە ژیاندایە، هەڵبەت بەم زووانە دەیبینم، تاکو ڕۆژانی ماڵوێرانی بیر خۆمان بهێنینەوە، کە زۆری درێژە کێشا و ڕوحی دەرهێناین.. وەلێ، کاتێک سکاڵای خۆم دەبردە لای پەروەردگار، هەواڵێکم خوێندەوە دڵی ئێشاندم و شەرمەزاری کردم، سەبارەت بەمنداڵێکی میسری بەر لە ڕۆژانی جەژن خۆی کوشتبوە، داوای لە باوکی کردبوو لە شوێن قۆندەرە دڕاوەکانی جووتێک پێڵاوی نوێی بۆ بکڕێت، تاکو

لای منداڵە برادەرەکانی گەڕەکی (بولاق دەکروور) خۆی پێوە هەڵکێشێت. کەچی باوکە هەژارە پێڵاو بۆیاغکەرە کڵۆڵەکەی نەیتوانی بوو ئەم حەزە قورسە دوورەدەستەی بهێنێتە دی، نەخوازە باوکی پێنج منداڵە، ئەو منداڵە دە ساڵانەش هیچی بۆ نەمابووە بۆ نارەزایی دەربڕین لەو ژیانەی دادپەروەریی تێدا نەماوە، خۆی بکوژێت.

ئەم نووچە بچووکە، لە نێوان سەدان هەواڵی ئەو ڕۆژەدا، گەڕاندمییەوە ئەو تێکشکانە ڕوحییەی ملیۆنان مرۆڤ لە سەردەمی تەکنۆلۆجیا و زانیاری و زیندانەکاندا بەدەستییەوە دەناڵێنن، بەر لە گشت ئەمانەش گەڕاندمیانەوە بێشەرمیی دەسەڵاتدار و هەڵەشەییەکانی، ئەو دەمی سەد ملیۆن یۆرۆی بەنەدارانی ئەمەریکا بەخشی، کەچی هەژارانی وڵاتەکەی خۆی لەو کاتەدا لە ڕێژیمی ئەتککردن و تاڵان و کارەساتەوە، پێویستیان بەنیوە ئاور لێدانەوەیەک و نیوە چاودێرییەک و نیوە بەزەییەک بوو.. هەر بۆ ئەوەی پتر جەخت لەسەر جەور و ستەم و بێ ئابڕووییەکانی بکاتەوە، ڕۆیشت، پارەی بۆ مناڵانی ئیتاڵیا تەرخان کرد، بۆ بنیاتنانی شانۆیەکی گەورە لە یەکێک لە گوندە دوورەدەستەکانی ڕۆما، تێچووی دروستکردنی ئەم شانۆیە بەشی ئەوەی دەکرد سەرجەم منداڵانی (مدینة الثورة) و شوعلە و گەڕەکی جیهاد و میکانیک و کەسرە و عەتەش تێر بکات، لە هەمان کاتدا بەشی ئەوەشی دەکرد پێڵاوی نایاب بۆ گشت مناڵانی قاهیرە بکڕێت، هەر لە شەبراوە تا بولاق دەکروور.

لێرەدا وتەیەکم بیر دێتەوە، لە یەکێک لە ڕۆمانەکاندا دەربارەی فەرمانڕەوایەکی زۆردار هاتووە، بنێشتی بۆ هەموو منداڵانی ئەو دەڤەرەی فەرمانڕەوایی دەکرد، کڕیبوو، دەرگەوانەکەی لێی پرسیوە:

– گەورەم، بنێشت چ سوودێک بەم برسییانە دەگەیەنێت؟

فەرمانڕەواش بەپێکەنینەوە گوتوویەتی:

– ئەوی بیانبینێت جاجگ دەجاون هەرگیز بیر لەوە ناکاتەوە، کە تۆ بۆی

چوویته، هەی دەرگەوانی گێل.

دیکتاتۆریش، دیکتاتۆرەکەمان، تەنانەت بیری لە فریودانی هاووڵاتییەکانیشی نەدەکردەوە، بگرە ڕۆژ دوای ڕۆژ لە هەر کاژێرێکی پەخشی تەلەفزیۆنیدا و لە هەر ڕۆژنامەیەک و لە هەر ڕاسپاردەیەک لە ڕاسپاردە نەزۆکەکانیدا، کە یەکسەر دوای ڕۆیشتنە پڕ لە ئابڕووچوونەکەی لەناوچوون، برسییەتی و سەرشۆڕی و ملکەچکردنی بیر دەخستنەوە.

کەسایەتییەکی نەخۆش و هیچی تر، جێی ئەو تەنیا شێتخانە و بیمارستانە.

لێ لە زەمەنێکدا دەرفەتێکی بینی دەرگەی نەخۆشخانەکەی کردەوە و توانی هەڵبێت، پاشان تێکەڵی ئاوەدانی بوو و میکرۆب ئاسا خۆی خزاندە ماڵەکانەوە، بەختی وای هێنا بگات بەتاقمێک دەروون نەخۆش و شێت و پیاوکوژ، ئیتر جێگەی شیاوی خۆی لە ناویاندا بینییەوە و میللەتیش بووە قوربانیی ئەم بەدگۆڕاوانەی پیلانیان دژ بەژیان و یاسا و ڕاستییەکان و ویستی پەروەردگاریش گێڕا.

تەنیا هەواڵێکی بچووکی ناو هەواڵەکانی ترە، وەک مردن و ئەو برسییەتییەی ڕۆژانە لەسەری دەخوێنینەوە، منداڵێک لە پێناو پێڵاوێکدا خۆی کوشتووە نرخەکەی لە دە جونەیهی میسری پتر نییە، کەس ئاوڕ ناداتەوە، نەکو ببینن.

***

لەو دەمی کۆتەڵەکە لە گۆڕەپانی فیردەوسدا کەوتووە، هێند مژووڵی فەرمانڕەوا نیم، چونکە چارەنووسی دیار و ڕوونترە لە بینینی پیرەمێردێک، کە پێی لە لێواری گۆڕدایە، ڕەنگە لەوی لە پەیکەرەکەی ماوە پێکەنینم هاتبێت، مەبەستم پێڵاوەکانیەتی، کە هێشتانەکینێ نەکەوتوونە، ئەو منداڵەی بیرخستمەوە، کە لەبەر جووتێک پێڵاو خۆی کوشت، دەیویست لە ڕۆژانی جەژندا لە پێی بکات، تاکو لای برادەرەکانی خۆی پێوە دەربخات.

ئەوی ماوەیەکە بیری لێ دەکەمەوە، ئەوەیە شاعیرانی شایی و ئاهەنگ و دەهۆڵژەنەکان و فرۆشیارانی ئابروو چی دەکەن؟ ئەی ئەو شاعیرە سووک و نەفامە چی دەڵێت، کە هەرچی سیفەتی پیرۆزی خوایی هەن و لە قورئاندا هاتوون، بە(سەرۆکەکەی) بەخشی؟ ئەی ئەو شاعیرە چی دەبێژێت تا سەرۆکی فەرماندەی لێ بەدیار دەکەوێت، نە مووژدە و نە بەخشش و نە باوەڕ و نە ڕەوشت دەبینێت؟ بەچ ڕوویەکەوە شەقام دەبڕێ و چی دەکات ئەگەر شەپۆلێک لە تووڕەیی خەڵکەکە هێرش بۆ سەر خۆی و سەرۆکەکەی ببەن؟ ئەم دەهۆڵژەنانە سەر بەکوێوە دەنێن، لە کاتێکدا هەڵایەک بەڕێوەیە؟ داخۆ کێ لە تووڕەیی خوا و ئازاری ویژدان و نەفرەتی خاک پەنایان دەدات، بەر لە هەموو ئەمانەش، کێ لە داخی دڵی دایکانیان دەپارێزێت؟

باشە، ئەوا ئەگەر ئێمە لە شاعیرانی بەزم و ڕەزم بووراین، لەوەی کردوویانە دەرۆست منداڵانی عێراق و ئەوانەی لە پشت پەردەکانی ڕێژیمەوە سەربڕاون، هەروەها ئەوانەی لە ماڵە نهێنییەکان و حەوزەکانی سیانیددا ونبوون، یاخۆ ونکران، داخۆ چۆن ڕوویان دێت داوای لێبووردن بکەن لەو هۆنراوانەی بەدرۆ و دەلەسە و بوختان لەبارەی کەسێکەوە نووسیویانە شایانی ئەوە نییە دێرە شیعرێکی هەژاریشی لەوەی نووسیویانە و هەڵیان گەڕاندووەتەوە لەسەر بنووسرێت؟

تاقە ساتێک چییە مێشکی خۆم بەدیکتاتۆرەوە خەریک ناکەم، چونکە چارەنووسی خراپە لەوە خراپترە ئەوان بیری لێ دەکەنەوە، لێ ئەوی ئەمڕۆ بیری لێ دەکەمەوە (هەروەها بەر لە هەراکەیش) دۆخی ئەو شاعیرە دەرۆزەکەرانەی وا لە ماڵی حەرام داهێزراون خەریکە دەتەقن.. داخۆ چی بەسەر خۆیان دێن ئەگەر ویژدانێک هەبێت لەسەر ئەو قسانەیان لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکات؟ بەڕاستی من خۆم ئاواتەخوازم دوای ئەم ڕووخانە ترسێنەرە سیمایان ببینم، خۆ ئەگەر هەلیشم بۆ ڕێککەوت (شەرم) بەتەوێڵیانەوە ببینم، ئەو کات هیچ ناڵێم تەنیا ئەوەندە نەبێت (خوایە ئەمە مایەی پێخۆشبوون و پێ پێکەنینە).

مامۆستا و ڕووناکیی چاوم ئەمین هاشم بەیتار هەر دەبینم، سەر دەنێمە سەر سینگی و تێر دەگریم، تا فرمێسکەکانم چک دەهێنن، ئەم پەرجووەی لە وڵاتەکەمدا بەدی هاتووە شایانی ئەوەیە بگرین، هەتا ڕۆندک لە چاواندا وشک دەکات، ئەمە یەکەمین جارە لە خۆشییاندا دەگرین.

## ئەمین هاشم بەیتار

سەرم تەواو هێور بووەتەوە، بەشێوەیەک لە ڕۆژی هەڵاتنەکەمانەوە لەو نەخۆشخانەیەی تێیدا بەتۆمەتی شێتی بەند کرابووم، بەم ئاوایە نەبوومە، ئەز شێت نیم، لە دۆخی مێشک پاراویدام، ڕووبارەکە دەبینم و دەڵێم (دیجلە) و (لە بێدەنگییەوە بۆ دەنگ) دەخوێنمەوە و دەڵێم (کتێبەکەم) پاشان بەشەقامەکەدا تێ دەپەڕم و دەڵێم (ڕەشید).

لەگەڵ خۆمدا ئەوی ڕووی دابوو دەیلێمەوە، هەر لە لێدانەوە تاکو زەڕین، دەڵێم (نەفرەتیان لێ بێت)، کاتی ئەوە هاتووە، تا ڕاستییەکان ڕێگەی خۆیان بۆ ناو خەڵکەکە بدۆزنەوە، پێش ئەوە دەبێت دان بەخۆدا بگرم، کێ دەزانێت، ڕەنگە ئەم دۆخی وشیاربوونەوەیە وێستگەیەکی درۆ بێت بەرەو ڕێگەی ئاوەز، ئەگەر شەوێکی تر بەردەوام بێت، ئەوجا دەزانم من گەڕاومەتەوە بۆ ئەو ئەمین هاشم بەیتارەی ناچاریان کرد مێژووی کەسیی خۆی بشواتەوە و هێڵێکی ڕاست و چەپ بەسەر هزرەکانیدا بهێنێت و یادەوەریی کوێر بکاتەوە، لەگەڵ یەکەمین بەرکەوتنی کارەباییدا دەمارەکانم ئیفلیج بکات و بەیەکەمین قامچی، کە بەر پشتم کەوت لە پیاوەوە کردمی بەکەر، دەبێت دان بەخۆدا بگرم، تاکو لە ڕۆیشتنی کوێدرێژەکە و داخستنی قەپۆزی دڵنیا بم.

لە کتێبەکەم بەولاوە ئەشتەبام پێ نەبوو، ئەو لەگەڵ مندا چاوبڕکێی دەکرد و منیش لەگەڵیدا چاوبڕکێ و عەشقبازی. تەنیا ئەو بوو لەوەی ئاگەدار کردمەوە، کە پێی گەیشتووم، لەگەڵیدا لەبارەی ئاوەزمەوە دەدوێم و دەڵێم (چی بکەم چاوێکم کوێرە و هیچی پێ نابینم)، تا ئێستاش بڕوام وایە ئەوی دیشداشە لەبەر دەکات دەزانێت دیشداشەی لەبەر کردووە، هەروەها، هێشتا وەکو سەردەمانی منداڵیم هەر لەو باوەڕەدام، ئەوی زوو بنوێت زوو بێدار

دەبێتەوە، لە سەرووی هەموو ئەمانەشەوە (بێ هیچ دوودڵی و گومانێک) وای دەبینم، ئەوی بابەتێک بۆ ڕۆژنامەیەک بنووسێت، بێگومان دەزانێت شتێک لەسەر ئەو ڕاستییە دەنووسێت، ڕەنگە هەندێک لە خەڵکەکە بێ ئاگابن لێی، لێ ئەوی ئەورۆ داخی بۆ دەخۆم (لە کتێبی لە بێدەنگییەوە بۆ دەنگ وام نووسیبوو) ئەوەیە بەمکورییەوە دان بەگەمژەیی و گێلییەکانم و خراپیی مەزەندەکانم و هەڵە و گومانەکانمدا دەنێم، بەبەڵگەوە بۆم دەرکەوت ئەوی دیشداشە لەبەر دەکات، بەسرووتی هەمان پیاو دەجووڵێتەوە، کە پانتۆڵی جینزی لەپێدایە، باوەڕیشم لە هەر بوونەوەرێکی سەر ڕووی زەوی زیاتر بوو (لە بزنەوە تا مەڕ و ئینجاش مرۆڤ)، ئەوی زوو بنوێت ناتوانێت بێدار بێتەوە، تاکو خۆر نەگاتە بان سەری، وێڕای گشت ئەمانەش زەوی خوولاندمییەوە و خۆم دەبینی، کە بێ هیچ گەواهیدەرێک زانیم هەندێک لەوانەی لە ڕۆژنامەکانمان دەنووسرێن بۆ مەبەستی تایبەت دەنووسرێن و مافیان بەسەر ڕاستی، یاخۆ بەشێک لە ڕاستییەوە نییە، ئەوانەی قسەی ڕێکخراو و ڕازاوەیان دەنووسی، وایان دادەنا خۆیان لە دەرەوەی بەرپرسیارێتی و لە دەرەوەی ڕاهاتنی ڕوحییەوەن، کە جەستە لە پیسییەکەی پاک دەکاتەوە، هەروەها لە دەرەوەی ئەو پرسیارانەوەن، کە چی دەنووسن، ئەوەتا بەدیشداشەیەکی سپییەوە بەبان سەرماندا دێن و دەچن و بڕوایان وایە (بڕوای ڕەها، بڕوایەکی گەوجانەیە)، ئەوە دواهەمین داهێنانەکانی (ئیڤ سان لۆران)ـە، پاشان لە دوا دێڕەکاندا دووبارەی دەکەمەوە (لە بێدەنگییەوە بۆ دەنگ) و دەچمە سەر بیرۆکەیەکی تر و هێرشێکی تر دەکەمە سەر قسەفرۆشان و دووکاندارانی سیاسەت و بە(بێ مێشکییەکی سەد لە سەدەوە) گریمانەی ئەوە دەکەم، ئەم بەرەی نیشتمانییە دەتوانێ هەم سەرم بپارێزێ و هەم سەرفرازییەکەم، هەرچەندێک لە بەرابەریاندا لە دڵڕەقی و دوژمنایەتی و تێوەژەنینیان بەردەوام بم.

***

"لە بێدەنگییەوە بۆ دەنگ" بەتوندی خۆی بەماڵاندا کرد، وای لێ هات ناوم

له شەقام و چایخانە و شوێنی خواپەرستی و بارەکاندا دووبارە دەبووەوە، لە نێوان قین لە دڵ و ئارەزوومەندانیدا، لە نێوان ئەوی خراپی پێ دەگوتم و ئەوی هەینێ ڕەت دەبووم کڵاوەکەی بەرز دەکردەوە، دوای چاپی سێیەمینی، کاغەزێک لە ژێر دەرگەکەوە فڕێ درابوو و تێیدا هاتبوو:

– هەموو کات بایەکان بەپێی حەز و ئارەزووی کەشتییەکان هەڵناکەن، ئەو کاتەش هەر دێت لە دەنگەوە بگەڕێیتەوە بۆ بێدەنگی، تەنانەت وات لێ دێت نازانیت ئەمین هاشم بەیتار کێیە، لەوی دەیڵێین دڵنیابە.

باشم لە یادە لەو کاغەزەدا چی هاتبوو، چون بەر لە نەختێک بۆیان نووسیبم، بۆ یەکەمین جار دوای چەندین ساڵ لە شێتی و ترس و سام دەستم دایە پاشماوەی پێنووسە ڕەساسەکەم و لەسەر چەند لاپەڕەیەکی سپیی کتێبەکەم نامەیەکم بۆ ئەو دەسەڵاتدارە نووسی، کە وڵاتی کرد بەتەویلەی درندە و جەلادان، پاش ئەوەی ڕووخا و ئیمپراتۆریا و قەڵا سەختەکەی هەرەسی هێنا، بەدەم گۆرانی گوتنەوە پێم گوت:

– ئێستا، سەرۆکی فەرماندە دەکرێت بۆت بنووسم، دوای ئەوەی بەیەکجاری نەمایت و کەس نییە لێت بترسێت، یاخۆ زراوی لێت بچێت، ئەم نامەیە ئاوا دەست پێ دەکەم:

ڕەحمەت لەو کەسەی نرخی خۆی دەزانێت، لێ نەتزانی گەیشتوویتەتە چ ئاستێک، بەکرێگیراوان بەهۆنراوە و ستران و چەپڵە و هەڵهەڵە فریویان دایت، تا وات زانی پەروەردگار زەلامێکی لە چەشنی تۆی نە لە ڕۆژهەڵات و نە لە ڕۆژئاوا نەخوڵقاندووە. هەڵبەت ئەی سەرۆک لەسەر حەقیت، من بەخۆم دەزانم ئەوی بەشان و باڵیدا هەڵدەدرێت هەست بەچ کۆزانێک دەکات، نەخوازەڵا کەسێکی لاواز بێت و لە بنەماڵەیەک بێت هیچ لە دنیا نەگات و وابزانێت دنیا تەنیا ململانێ و دەست و بازوو و هێزی جەستەیی و تێڵا و تاڵان و بڕۆ و ئەتککردنە، ئەو دەمیش هەر لەسەر حەق بوویت ئەو ڕۆژەی لووتت تا کەشکەڵانی فەلەک بڵند کردەوە، هەینێ پەیکەرەکانی خۆتت لە گشت لایەکی عێراقدا بینی و بەدڵێکی خۆشەوە بەشەقامەکاندا بێ پەروا ڕێت

دەکرد، دەتگوت هەموو دنیا لە دەستی تۆدایە، هەرچەندێک لە ڕاستیدا هەرچییەکت بکردایا نەتدەتوانی هێندەی چیایەکی سەرکەش مل هەڵکەیت. بەڵێ، تۆ لەسەر حەق بوویت، کاتێک ویژدانی کاسەلێسان و سەدان نووسەرت لە نیشتمانی عەرەبیدا کڕی، ئەم کڕینە ناوێکی لە نێو سەرۆکە گەورەکاندا پێ بەخشییت و فێری دانیشتنی سەر سیسەمی کردیت. بیرتە سەرۆکایەتییەکەت بەسەردانی ماڵە هەژارەکان دەستی پێ کرد، یەخچاڵی خێزانە نەداراکانت دەپشکنی و لەگەڵ ناخە نەخۆشەکەتدا دەدوایت (ڕۆژێک دێت هیچ لە ماڵەکانتاندا نابیننەوە)... پلانی تێکدان و ماڵوێرانی و مەرگت دەکێشا، کە هەر بەڕاستی خاکی عێراقی گرتەوە، دەروونە ڕیسواکراوەکەت تۆڵەی لە ڕۆژانی منداڵییە پڕ لە کلۆڵییەکەت دەکردەوە، ئەو کاتی بەپێی پەتی بەنێو کەلاوەکانی عۆجەدا تەراتێنت دەکرد، هەر لەبەر ئەمەش بوو ئەوی دەیناسییت لەناوت برد، کوشتیانت، چونکە ترسایت ئابڕووت ببەن و پەردە لە ڕووی نەگریسی و هەژاری و چەقۆکێشی و بێ ئەدەبییەکەت هەڵماڵن.

تۆ خوێندنی دواناوەندیت تەواو نەکرد، کەچی لە گشت لایەکەوە بڕوانامەی دوکتۆرات بەسەردا باری، هەروەها (ئەمەش هەمووان پێی دەزانن) تاقە کاژێرێک چییە لە سوپای عێراقدا خزمەتت نەکردووە، کەچی لەپڕێکدا بەقودرەتی قادر بەپلەی سوپاسالاری ڕوکن بوویتە فەرماندەی گشتیی هێزە چەکدارەکان، لە کاتێکدا تەنانەت سڵاوکردنت بەدەستی ڕاست نەدەزانی، چونکە ئەو دەستەت تایبەت بەکوشتن بوو.

ڕاستییێلێکی زۆر هەن لێرەدا شوێنی گێڕانەوەیان نابێتەوە، ئەوە پێویستی بەکتێبی چەند بەرگ و سەرچاوە و فەرهەنگی جۆراوجۆر هەیە، لێ ئەوی لە هەمبەر تۆوە نایزانین بەملیۆنان جار لەوە مەترسیدارترە، تەنیا ئەوەندە بەسە تۆ ئەم خوێڕی و هەرچی و پەرچی و نەزانانەت هێنانە پێشەوە و داری فەرمانڕەواییت دانە دەست، تا بەسەر بێگوناهاندا بڕن بەسوڵتان. چونکە وات هەست دەکرد (زانست و ڕۆشنبیری لەگەڵ کوشتن و بڕین و دزی و نامووسبردندا نایەنەوە)، ڕەنگە ئەوی لە هەموو شتەکان زیاتر بەپێکەنین و

گریانی خستبین ئەوە بوویێت نایب عەریفێکت هێنابێت (لەلایەنی دەروونییەوە ناتەواوە) تا ببێتە وەزیری بەرگری.

سەرۆکی فەرماندە، تۆ هیچ نیت، لە سەرسورهێنەرەکانی دنیاش ئەوە بوو ئەم (هیچە) فەرمانڕەوایی دەکردین و فەرمانی بەسەردا دەداین.. تۆ هیچ نیت، هیچ، هیچ.

***

خەریک بوو سەرم بەردەبووەوە، هاوارم دەکرد و دەمگوت (هیچ، هیچ)، هەستم بەبەتاڵیی گەدەم کرد، جەستەم قووپابووە ناوەوە، دوای ئەوەی دەستم بەنووسین کرد و لە باشترین دۆخدا بووم، هێندەم نەمابوو لەبەر بێ ئارامی بتەقم. پێنووسەکەم شکاند و کتێبەکەم چوون دووپشکێک بێت و ویستبێتی پێوەم بدات، ئاوام تووڕهەڵدا، سەرم بەتوندی خستبووە نێوان دەستەکانمەوە نەکو جارێکی تریش پاش ئەوەی لە شێتوشوورییەکەم بێدار بوومەوە، ئاوەزم لەدەست بدەمەوە، بەخۆم گوت و تکاکاری بووم و لە ئەمینەکەی دەپاڕامەوە:

ئەمین دەبێت دان بەخۆتدا بگریت، هیچ شتێک نییە شایانی ئەوە بێت لەپێناویدا جارێکی تر شێت ببیتەوە.

کتێبەکەم هەڵگرت و داوای لێبووردنم لە کاغەزەکانی کرد و بڕیارم دا درێژترین مەودا بەقەراخ ڕووبارەکەدا ڕێ بکەم، تاکو خۆم لە هەڵاوسانە ترسناکەکەی بپارێزم.

***

کات بەسستی دەڕۆیشت، لێ دوور بوو لە ترس و تۆقینەوە، دوای ئەوەی لە گەڕانەوەی شانەکانی ئاوەزم بۆ شوێنی خۆیان خاترجەم بووم، ڕووبارەکە قوتاری کردم، هەینێ بەڕۆخیدا ڕێم دەکرد، دوور نییە لەوێ گریابم، تاکو لە کەفوکوڵ و ژانەکانم کەم بکەمەوە، سوپاس بۆ خوا، نە سەرێشە و نەیش حەزی زەڕین، ئەو نامەیەم خوێندەوە، کە بۆ سەرۆکی لابراوم نووسیبوو، بۆم دەرکەوت توانای ئەوەم هەیە پارچەکانی خۆم کۆبکەمەوە و ئەمین هاشم

بەیتار بگەڕێنمەوە ناو ژیان، کە زۆر لەمێژە جێی هێشتووە.

چوومە ماڵەکەم لە عامریە، کەسم تێدا نەبینییەوە، دایک و باوکم لە داخ و حەسرەتی من مردبوون، براکانیشم لە شەڕەکانی سەرۆکدا کوژران، یەکێکیشیان سەری هەڵگرتبوو بۆ وڵاتێک هیچ یەکێک لە دراوسێکان نەیاندەزانی چی بەسەردا هات، خانووەکەش جگە لە کەڵەکە بەردێک هیچی دی نەبوو، پاش لە تەلەفزیۆن دەرچوونە ئابرووبەرەکەم بەهەفتەیەک ڕووخاندبوویان و شتێک نەمابووەوە نەدزرابێت، لێ عەبدولعەزیزی دراوسێمان پێی ڕاگەیاندم توانیویەتی شتێلێکی زۆر ببات و لە گۆشەیەکی ماڵەکەیاندا بۆمانی بپارێزێت، کەنگێ بمویستایا دەمتوانی بیانبەم.. پاشان پرسیاری ئەو چەند ساڵەی لێ کردم، دوای یەکەمین فرمێسک لە بەردەرگەی ماڵ بەربووەوە، بردمیە ژوورەوە و داخی بۆ ئەو ماڵوێرانییە دەخوارد، کە بەسەر من و بنەماڵەکەمدا هات و لەبەر دەرکە باس ناکرێت.

چایمان خواردەوە، ژنەکەی هات و دەستی بەشین و شەپۆڕ و لاوانەوە کرد، لەسەر ئەو چارەنووسەی لە هی کەس ناکات، ئینجا ئەوی مێردەکەی پێی گوتم سەبارەت بەگلدانەوەی هەندێک پاشماوەی ماڵەکەمان، کە دزێل لە ماوەی کەمتر لە دوو کاژێردا تالانیان کرد:

وێنەی من لە تەمەنی دە ساڵیدا لە نێوان باوکم و براکانمدا دەخەنمەوە، چوارچێوەکەی لە ئاوی زیوە، زنجیرێکی زێڕ بەکاتژمێرێکەوەیە لە باوک و باپیرمەوە ماوەتەوە، سێ قەنەفەی لە داری سەندەڵ چێ کراو، تا نووکەش ئیسفەنجەکانیان پتەو و ڕێکوپێکن، سندووقێکی کڵۆمکراوی تەختە. عەبدولعەزیز گوتی توانیویەتی بەزۆر لە دەستی دزەکانی دەربهێنێت، دوای ئەوەی هانای بۆ ژنەکەی و کوڕەکەی بردبوو، هەروەها گوتی (خوا شاهیدە ئەمین من تا ئەم ساتە نازانم چی تێدایە)، دواتر بوخچەیەک کراس و پانتۆڵ و چەرچەف و ئوتی و تەنوورە و عابا و باوەشێک کتێب، کە دزێل بێ ئەوەی خەمی لێ بخۆن جێیان هێشتبوو.

دراوسێکەم گوتی:

- هەرچی شتەکانی ترن، لە چاوقووچانێکدا بردیان، تەلەفزیۆن و تەختەی هۆڵەکە و مافوور و سەرجەم شتە کارەباییەکان، تەنانەت پەنجەرە و پەردە و تابلۆکانیشیان بردبوون، نەک هەر ئەمانە بگرە دەستشۆر و دەرگەی ژوورەکانیشیان هەڵتەکاندبوو و لە خۆشییاندا دەیانشیڕاند.

بەچرپەوە لە مێشکی خۆمدا گوتم:

- برسییەتی شتی سەیر و سەمەرە بەمرۆڤەکان دەکات.

گوێم لێ بوو عەبدولعەزیزی دراوسێمان پرسیاری ئەوەم لێ دەکات، داخۆ دوای ئەم هەموو زیان و ماڵوێرانییە چی دەکەم؟

گوتم: نازانم، من پێویستم بەئاوەزمە، هەرچی ئەوانەی لە کیسم چوون و دزیان، ڕۆژێک دێت دێتەوە شوێنیان.

تەماشایەکی دراوسێکەمانم کرد: داخۆ ژوورێک لەم گەڕەکە دەست دەکەوێت، تاکو بەکرێی بگرم؟

بێ ئەوەی بیری لێ بکاتەوە، گوتی:

- ئەمشەو لای ئێمە دەمێنیتەوە، ئاوێک بەخۆتدا بکە و جلەکانت بگۆڕە، بۆ سبەینێش خوا کەریمە.

بێ هیچ هەستکردنێک بەشەرم و ڕیسوایی پێم گوت:

- پێویستم بەهەندێک پارە هەیە، تاکو بتوانم خۆم لەسەر پێ بگرمەوە.

بەدەم زەردەخەنەوە بردمی بۆ نهۆمی دووەمی ماڵەکەی:

- چۆنت دەوێت وا دەبێت، گرینگ ئەوەیە، یەکەمین جار گەرماوەکەت بکەیت، پاشان نانی شێوان پێکەوە دەخۆین، ئاسوودە دەبیت و بیری لێ مەکەوە.. ئەوی گرینگە مۆتەکەکانت لەسەر لاچوون.

لە دڵی خۆدا بەبێدەنگی گوتم (بەڕاستی ئەمە گرینگە)، لە پەنجەرەی ماڵەکەوە سەرنجی ئەو کەڵەکە بەردەم دا، کە ڕۆژێک لە ڕۆژان ماڵی ئێمە بوو، کەچی دراوسێکەمان پەردە شینەکەی داخست و گوتی:

– سەرت مەیەشێنە.. تکایە، سەرت مەیەشێنە، ئێمە پێویستمان پێتە.

لەو دەنگە نزمە ڕۆشنەوە (ئێمە پێویستمان پێتە) عەبدولعەزیز سەربەرزییەکەمی بۆ گەڕاندمەوە، کە لەوێ لە ژووری زەڕین وردوخاش بوو، بێ ئەوەی بزانم ئەوی ڕووی دا چۆن ڕووی دا، هەستم کرد وەک ئەوەی بەهیچ شێوەیەک سالآنی ڕیسوایی نەژیابم و ڕۆژێکیش نەزەڕیبم.

***

چەندین ملیار ساڵە پێخەفی وام بەخۆوە نەبینیوە، هەینێ ئەو ئاوە گەرمە خۆشەم بەخۆدا دەکرد هەستم بەشتێک کرد لە بەهەشت دەچوو، تا وام لێ هات خەریکبوو لە ژێر تاڤگەی ئەو ئاوەی بەسەر پێستەکەم و ئەو کونیلانەی چەندین سەدەیە گیراون، دەڕژا، گۆرانی بچڕم، بێ ئەوەی بەخۆم بزانم لە خۆشییاندا گریام.

عەبدولعەزیزی دراوسێم مۆڵەتی ڕۆژێک، یاخۆ شەوێکی لە ماڵەکەی خۆیدا پێ دام، دوای ئەوە دەبێت ژوورێک بۆ کرێ بدۆزمەوە، تا ئیتر بەدوای چارەنووسی خۆمدا بگەڕێم، کە لە نێوان ترس و هیوادا دەستبازی لەگەڵدا دەکردم، ڕەنگە لە نێوان بەهەڵەداچوون و دڵنیاییدا بووبێت، بەڵکو سەرلەنوێ دەست پێ بکەمەوە.

داخۆ دراوسێکەم، ئەم مرۆڤە دەست و دڵ باشەی هەندێک کەلوپەلی ماڵەکەمی لە دزین ڕزگار کرد، چی لەبارەی منەوە دەزانێت؟ بەتەواوی دەزانێت من کێم؟ بڕوا ناکەم هیچ شتێک لەبارەی ئەمین هاشم بەیتارەوە بزانێت، کە ناچاریان کرد لە شاشەی تەلەفزیۆنەوە بەدەربکەوێت، تا بڵێت حزبی شیوعی لە عێراقدا بوونی نییە و لەسەر هاوڕێیانە بێ شەڕ و سەرێشەی بێ مانا خۆیان بدەنە دەستەوە. ئەم پیاوە پاکە خانەدانەی ژوورەکەی خۆی پێ بەخشیم و کردمیە گەرماوی ماڵەکەیانەوە، تاکو خۆم لە چڵکنیی ئەو سالآنەی لە نێوان ترس و زەڕیندا تێپەڕبوون پاک بکەمەوە، چی لەبارەی منەوە دەزانێت؟ کەچی دەڵێت (ئێمە پێویستمان پێتە)، ئەمەش مانای وایە شتێک لەبارەی منەوە دەزانێت.

بیرم لەوە دەکردەوە سبەی چی بکەم، کام لەو هاورێیانە دەبینم، کە ماون و پێیان بڵێم بەر لە حەڤدە ساڵ بەزۆر ناچاریان کردم ئەو قسانە لە تەلەفزیۆندا بکەم و چۆن سێزدە ساڵیم لە شەماعیەدا بردەسەر، دەبێت ئەوان دەرک بەو شێوازی ئەشکەنجەدانە بکەن، وای لێ کردم قسەیێلێک بکەم، کە نەدەبوو بمکردنایا، ئیتر قۆڵی لێ هەڵدەماڵین و دەست بەخزمەتکردنی وڵات دەکەین.

لە مێشکی خۆدا گوتم: من نازانم کێیان ماون، هەموویان بۆ هەندەران چوون، بڕواش ناکەم (مەبەستم ئەوانەیە کە ماون) بزانن من کێم؟ لێ مێژوو منیان بیر دێنێتەوە و وەک بەر لە دەرچوونم لە شاشەی شەرم و بێ ئابڕووییەوە بەقسەم دەکەن، کە بەدەرچوونم لەودیویەوە تووشی سەخڵەتییان کردم، ئەو کاتی دەمگوت؛ حزبەکەمان دوایی هات و دەبێت خۆیان بدەنە دەستەوە و چەکەکانیان ڕادەستی دەسەڵاتی بەعس بکەن، کە لە ڕۆژهەڵات و خواروو و ڕۆژئاوا و ژووروودا جڵەویان گرتووەتە دەست.

دانی پێدا دەنێم ئەوی لێیانەوەی دەبیستم زراوم دەبات، من ئەو ڕابەرەم لە ساتی سەرشۆڕی و ترسدا خۆی لە حزبەکەی بێبەری کرد، بڕواش ناکەم لەسەر ئەوەی کردوومە کۆک بن، پێش ئەوەی ماڵەکە جێهێڵم بەعەبدولعەزیزی دراوسێم گوت:

– ئەی پیاوە باشەکە من منەتبارتم بۆ گشت ئەوانەی لەگەڵتدا کردم، لێ کاک عەبدولعەزیز لێت دەپرسم، داخۆ دەزانیت من کێم؟

دراوسێکەم بەدەنگێکی پڕ لە خەمەوە گوتی:

– کاک ئەمین چۆن ناتناسم، تۆ بوویت نکوڵیت لە هاورێیانت کرد و داوات لێ کردن سەر بۆ ویستی حزبی دەسەڵاتدار دانەوێنن، لێ من لە هەمان کاتدا دەزانم تۆ ناچار کرایت، خوا لە پشتت بێت ئەگەر دوای ڕووخانی ڕێژیم بگەڕێیتەوە لای هاورێیان.

دواتر گوتی:

– لەلایەن منەوە دڵنیابە، من دەزانم ئەشکەنجەدان لە ژێرزەمینەکانی

هەواڵگریدا چی دەگەیەنێت.

لەو دەمی بەملی کەچەوە سەیری زەوییەکەم دەکرد، پێم گوت:

– جگە لەوانەی مردوون کەس نازانێت لەوێ چییان دەکرد، ئەفسووس مردوویش ناتوانێت قسان بکات.

– لێ دەرچوویت و نەمردیت.

لەو دەمی لە چاوانیم دەڕوانی گوتم:

– مردوویش جۆری زۆرە، من لە بابەتی مردووی زیندووم.

عەبدولعەزیز مشتێک دیناری پێ دام، بینیم گەلێک لەوە زۆرترە، کە من پێویستم پێیەتی، لێ گوتی:

– ئێستا کاتی بیرکردنەوە نییە لە پارە، هەوڵدە هەندێک لەوەی لەدەستت داوە بگێڕیتەوە.

هەر بەڕاست بیرم لەوانە کردەوە، کە زیانم کردوون، بینیم هەموو شتێکم لەدەست داوە، هەرەتی گەنجیم و خۆشترین ڕۆژەکانی حەز و ئارەزووم، گشتی وەکو شووشەی شکاو پرش و بڵاو بوونەوە، تەنانەت وەکو ئەوانی تریش ژیانم نەژیام، نە ئافرەتێک و نە دڵداری و نە یادەوەری، تەنیا ئەوە نەبێت لە نەخۆشخانە و ئەودیوی ژوورە داخراوەکانەوە ژیام، کە جگە لە گریان و سکاڵا و هاواری ئازارچەشتووان نەبێت.

## سەفیە

یەخچاڵەکەی عەفرا لێوانلێو بوو لە خواردنی لەقووتوونراو و گۆشتی وردکراو و شەربەت و سەوزەی بەستوو، عەفرا لە پاژێکی بەهەشتی جێ هێشتم، خەریکبوو لە خۆشییاندا دەست بەگریان بکەم، کە چەندین ساڵە نەمبینیوە، بەشەو و ڕۆژ دەنگی تەقینەوەم دەهاتە بەرگوێ، لێ ترس بەتەواوی جێی هێشتم و گوێم بەهاڕەی فڕۆکەکان نەدەدا، دەرگەی ئەپارتمانەکە بەسێ قفڵی گەورەی پۆلایین کلۆم کراوە، کە ناتوانرێت هەڵکەنرێت، یاخۆ بێنە ژوورەوە (جگە لە من کەس ناتوانێت بێتە ژوورەوە)، لەسەر هێمایەک ڕێک کەوتبووین، هەینێ عەفرا بۆ سەردانم بێت، یاخۆ بۆ کڕینی پێداویستییەکانم لە برنج و میوە، سێ جاران لە دەرگەکە دەدات، پاشان دوو جار، ئینجا یەک جار، پێویستە لە هەر ساتێکدا بێنمەوەی بیر خۆم، کە ماڵی من نییە، ئەگینا ئەگەر ئەم شوێنە بۆ خاوەنەکەی بگەڕێتەوە خۆم دەدۆڕێنم، ناکرێت ئەم بەهەشتە بچووککراوەیە تا سەر بۆ من بێت.

لە ئێوارەیەکی درەنگدا لەپڕ تانکەکان و گڕەگڕیان و ڕۆژانە تەقینەوەکان نەمان، دەستم بۆ کتێبەکانی ناو دوو دیوارەکە درێژ کرد، هەندێک وێنەی بەسەریەکدا دراو لە قەد دیوارەکانی ماڵەوە کێشرابوون، بۆم دەرکەوت ئەو کتێبانەی لێرە و لەوێ فڕێدراون عەمار موزهری مێردی هێناونی، ئەگینا عەفرا پێوەندیی بەخەباتی هیتلەرەوە چییە، یاخۆ بیرەوەرییەکانی سەرانی دووەمین جەنگی جیهانی و ئیمپراتۆر و بازرگانەکانی، باوەڕ ناکەم ئەوی ڕایخی سێیەم، یاخۆ گستاپۆ کردوونی، ئەم بەهەندیان وەربگرێت، لێ کتێبێکم بینی، لەودیوی بەرگەکەیەوە شاردرابووەوە، کە بەرگی خۆی نەبوو، زانیم عەمار شێخی مێردی هێند لە حکوومەتەکەی دەترسێت، پتر لەوەی

خەڵکەکە زەندەقیان لێی چووە، کاغەزەکان بەماجیکی ڕەش ڕەشکراونەتەوە و دێرەکانی هێڵی سووریان بەژێردا هێنراون، خۆم بینییەوە پیت و لاپەڕەکانم ڕاوەدوو دەنا، چون لە شتێکی پەنهان بگەڕێم، قسەکانی زەلامێکم دەخوێندەوە بەناوی (عەبدولئیلاه سەلیم حەجاوی)، وا دیاربوو لەبارەی خۆیەوە و ئەو ڕۆژانەی لە بەغدا کاری دەکرد چی بەسەردا هاتووە، قسانی دەکرد، دەیگوت:

(یەکەم هەنگاوەکانم لە بەغدا ساڵی ١٩٧١ دەستی پێ کرد، کە بەدوای بژێوی ژیانمدا عەوداڵ بووم، سێ ساڵ لە زەلکاوەکانی ژیانم بەڕێ کرد، تاکو گەیشتمە دوا وێستگە لە ئیشی کارگێڕی لە ژێر ساباتی ڕۆژنامەی "الثورة"ی زەمانحاڵی حزبی بەعسی دەسەڵاتداردا، جارێکیان لە بەشی ژمێریاری و جارێکیش لە بەشی ڕیکلام کارم کرد، دواتر لە بەشی گەنجینە، تاکو ساڵی ١٩٩٠ و داگیرکردنی کوێت و ئەوی ڕووی دا لە تالانی بەرنامە بۆ دارێژراوی ئەو وڵاتە، یەکێک لە کارەکانی من ژماردنی ئەو شتانە بوو، کە لە کوێتەوە دەدزران، تاکو شەڕ لە نیوەی دووەمی مانگی حوزەیرانی ١٩٩١دا هەڵگیرسا و ڕژێم شکستی هێنا و سوپای عێراق لە خاکی کوێت وەدەرنرا، شتە دزراوەکان جارێکی تر دەدزرانەوە، پشێوی بڵاو بووبووەوە، تاوان تەشەنەی کردبوو و مۆدەی دزینی ئۆتۆمۆبێل و تاڵان و برۆ و تەنانەت کوشتن بەنوێژی نیوەڕۆ بووبووە شتێکی ئاسایی، سنوورێک بۆ ئەو ئاشووبە نەمابووەوە. هەینێ بینیم عەمبارەکان لەلایەن ئەم بەرپرس و ئەو بەرپرسەوە دەدزران، لەوی ڕووی دا بەڕێوەبەرم ئاگەدار کردەوە، وڵامی دامەوە (ئەوە ئیشی تۆ نییە)، کەچی بەرپرسیارێتییەکی گران بوو و یاساکانی ڕژێم لەم بارەیەوە توندوتیژن و دوور نییە لە چاوترووکانێکدا لەدارت بدەن، بۆیە ڕاپۆرتم بۆ سەباح یاسینی سەرنووسیار نووسی، کە دوایی بووە باڵیۆزی عێراق لە ئوردن، ئەو پێی گوتم:

– دڵنیابە، مادامەکی لەوی ڕووی دا پێت ڕاگەیاندم، تۆ لە بەرپرسیاریەتی بێتاوانیت.

هەروەها بەڵێنی پێ دام، ئەگەر کێشەکە گەیشتە لای گەورە بەرپرسان،

یاخۆ دادگە پشتگیریم لێ بکات.

پاشان ئەڵقەکانی پیلانگێڕی ئابڵووقەیان دام و تەنگتر دەبوونەوە، هەستم کرد بەتەڵەوە بوومە، دوایی لە نێوان دەستی دادگەدا جێیان هێشتم، لەگەڵ کۆمەڵێک دز و جەردەیان دانام، من تا ئەو ساتەش قەناعەتم وابوو، کە دادگە قسەی ڕەوای خۆی لەبارەی منەوە دەڵێت، من تاقە شایەدێکم لە دۆزی دزراوەکان، بەڕێوەبەری چاپخانەش پشتی بەڕێوەبەری عەمبارەکان بوو، بۆیە ئەمیش ئەگەر دزە گەورەکان ئامادە بوونایا لە ترساندا بێدەنگی لێ دەکرد، نەخوازەڵا کوڕانی سەرۆک و ئەوانی نزیکن لێوەی، ئەوەتا لە چاوترووکانێکدا لە شایەدحاڵەوە دەبمە تۆمەتبار، کەچی پەروەندی دزەکانیش داخرا و بێتاوان دەرچوون، من کەوتمە داوی یاساوە و حەوتساڵیان بەتەنگەمدا دا، منیش لەو دارستانەدا هیچ دەسەڵاتێکم نەبوو، هەر کە یاسا وردوخاش بوو و بووە وشترێک چ وشترەوانێک دەهات سواری پشتی دەبوو و گاڵتەی پێ دەکرد، ئیتر نە ڕەوشت ما و نە باوەڕ.

دووەمین گەشتم لە ئەبوغرێبی بەدیوم دەستی پێ کرد، ئەو شارەی بەستەم و یاسای دارستان دەورەدراوە، بەشێکە لە دۆزەخ و هیچ پێوەندییەکی لەگەڵ مرۆڤەکاندا نییە، بەسەدانم بینی بەسیخوڕی و ناپاکی تاوانبار کرابوون، هەروەها ئەوانەی لە ژێر ئەشکەنجەداندا گوتیان (چیتان دەوێت دانی پێدا دەنێین)، ئەوەتانێ لە لیستی لەداردان و گوللەباراندا چاوەڕوانن، بەدەیانیان لە ژێر کارەبا لێداندا مردن، تێیاندایە مێشکی لەدەست داوە و تێکچووە، تا ئێستاش باسی شێتی هەر بەری نەداوە، ڕەنگە ئەمە لە کوشتنی ڕۆژانەی ژێر قامچیی جەلادان باشتر بێت، هەرچی نەخۆشیی سیلە ئەوە میوانێکی لەپەوڕوو کەوتووی گشت گۆشەیەکی شاری تاریکییە.

هۆڵی لەداردانیان پێ پاک دەکردمەوە، خوێن و خوڕ و بۆن و دیمەنێلێک تەنانەت دڵی شەیتانەکانیشیان دەهێنایە لەرزین، هێند دڵڕەقی و سەرشۆڕی و ڕیسواکردنم بینی، هیچ ناوێکم نییە لێیانی بنێم، وابزانم بەسەدان ساڵ لەوێ مامەوە، هەرچەندە من بەر لەو حەوت ساڵە دەرچووم، نازانم ئەوی لەوێ

ڕووی دا چۆنی لێک بدەمەوە، لێ ڕۆژانە بەر لە نووستنم ئەوە دەڵێم: خوا یارمەتیت بدات عێراق.

***

منیش ئەوی عەبدولئیلاه سەلیم حەجاوی دەیگوت، دووبارەم دەکردەوە (خوا یارمەتیت بدات عێراق)، پاشان لە کۆتاییی ئەو یادەوەرییەدا ئەوی بەدەست نووسرابووەوە سەرنجی کێش کردم، ڕەنگە ئەمە خەتی عەمار شێخ بێت، کە لە پەراوێزی ترسدا نووسیبووی:

- کابرایەکی بێتاوانی تر، ئەگەر ویستی یەزدان نەبوایا لەوەیە بمردایا.

بەحەسرەتەوە کتێبەکەم داخست، لە خۆم پرسی داخۆ لە نهۆمی ژێرەوەی خاکی عێراقدا چی قەوماوە؟ چییان بەم وڵاتە بەستەزمانە کرد؟ ئەوەم بەمێشکی خۆمدا هێنایەوە، کە پێیان کردم، زۆر سەیرم بەوەدا نەهات، کە بەسەر حەجاویدا هاتووە، ئەوان لە قورێکن دەستی فریشتەکانیان پێ نەگەیشتوون و خواش بەدەستیانەوە گرفتار نەبووە، ئەو گڵاوییە مۆرکی شەیتانی بەخۆوە گرتووە و ئەو خراپەکارییەش پیشەی ئیبلیسە، تەنانەت شەیتان بەخۆی ناتوانێت ئەوە بەخەڵک بکات، کە ئەمان لە کوشتن و شێواندن و زۆرگێیی کردیان، ئەو بوونەوەرانەی لە شەماعیە لە هۆبەی ژمارە ۹ و ژمارە ۳دا ناسیمن، دەبوو زوو لەناو بچن و لە دنیادا نەمێنن، ئەفسووس، کەوا ئەو چۆکی بەسەر سینگماندا داداوە و بۆ دڵە بێ هێزەکانمان بووەتە بارگرانییەکی ئەوتۆ، کە لە هەڵگرتن نایەت.

ئەوەتا بەرەو خراپترین چارەنووس دەڕوات، سوودی چییە لە کاتێکدا بەهەزاران لاومان لە جەنگێلێکدا لەدەست چوون، هێشتاش کڵپەی لەسەر ئەم زەوییە بەدیۆمە هەر ماوە؟ چ نەگبەتییەکمان تووش هات و تا چ قووڵییەک بەزەریای هەڵەدا ڕۆچووین؟ ئەی کەنگێ سەر هەڵدەبڕین و وەکو مرۆڤەکانی تر دەژین؟ کەی بەختەوەری دەدۆزینەوە؟

هەستم بەتینوویەتی کرد، چون چەند مانگێک بێت ئاوم نەخواردبێتەوە؟ لە

پەنجەرەی هۆڵەکەوە تەماشای بەغدام کرد، ئەم پیرەژنەی سەدان پێغەمبەر و شاعیر و خەڵکی باش بەزەوییەکەیدا تێپەڕین، ئەی ئەم جەلادانە لە کوێوە هاتن و چۆن توانییان بێ ئەوەی دانیشتووانەکەی بزانن خێروبێرەکەی تالان بکەن؟ لەو دەمەدا ئاواتم خواست دەربچوومایەتە دەرەوە و سەرهاتی خۆمیان بۆ بگێڕمەوە، لێ شەوەکە گرتمییە خۆی و فرێی دامە سەر جێگەیەکی ڕیشوودار و وێڕای نەرمییەکەی گەڕاندمییەوە بۆ یادەوەرییەکانی ئەوێم، بۆ شێتخانە.

## عەمار موزهر شێخ

لە هەر گەشتێکدا بۆ ئەوبەری زەوی و بەهەشتەکانی، سەد دۆلاریان بۆ هەر ڕۆژێک لەو چێژە لە خوێن هەڵکێشراوانە دەداینێ، بەخۆڕایی لەگەڵ ئافرەتدا ڕامان دەبوارد و باشترین خواردنەوەشمان هەر بەخۆڕایی نۆش دەکرد، لە چاکترین ڕیستۆرانتدا نانمان دەخوارد و لە قاوەخانەی شەقامەکاندا دادەنیشتین و لە گازینۆ گەورەکاندا قومارمان دەکرد و لە ئوتێلی پلە یەکی پێنج ئەستێرەدا بەخۆڕایی دەنووستین، دوای ئەم هەموو شتانەش سەد دۆلارمان بۆ هەر شەوێک وەردەگرت، کە لە بەهەشتەکانی ئەوروپا و خۆشییەکانی بەسەردەبرد، هەروەها بەدیاریێلێکەوە دەگەڕاینەوە کەس لە عێراقدا نەیبینیبوون. بەخۆڕایی، لەگەڵ وێسکی و جگەرە و شەرابی چەند ساڵەدا، لەگەڵ سەدان وێنەی فۆتۆگرافیدا، لە بۆدابست پێدەکەنین، یاخۆ لە دەریاچەی بیلاتۆندا مەلە دەکەین، لە ڕۆما لە ژێر ئاوی ڤانتانا دی ترەیڤی زنزانۆ دەخۆینەوە و کۆتری برژاو لە ڕیستۆرانتی ڤیکتۆر هیگۆ بەخۆڕایی دەخۆین، کەچی ئەو ئەمینداری سندووقەی لەگەڵماندا بوو شەو نا شەوێک، بگرە لە هەر کاژێرێکی گەڕانەکانماندا لە سوپەر مارکێتەکاندا، پێی دەگوتین:

– کوڕینە، هێشتا نۆ هەزار دۆلارتان ماوە، دەبێت بەر لەوەی بگەڕێنەوە بەغدا خەرجی بکەن.

ڕێگەی پێ نەدرابوو فلسێک چییە لەو وردە خەرجییانە بگەڕێنێتەوە، کە دەزگای هەواڵگری فەرمانی لەسەر دەدات، بۆ گەشتەکانی مەشقکردن و ڕابواردن و دۆزینەوەی شێوازەکانی ئەشکەنجەدان لە بەرلین و مۆسکۆ و ئەو شوێنانەی تر، کە مانگ نا مانگێک سەریان لێ دەدەین.

***

هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا و بیرم لە چارەنووسم دەکردەوە، کە بەڵای خۆمەوە زانراو بوو، گشت ئەو سەفەرانە و ئافرەت و خواردنەوە و فریودانەکان لەگەڵ مندا سوودیان نەبوو، چونکە دڵ بەپێی حەز و ئارەزووی ئەوان لێ نادات و ترسیش بەشی خۆی لێم دەبات، من لەو جۆرە نیم، کە بێ ئەوەی چاو بتروکێنێت دەتوانێت مرۆڤ بکوژێت، تەنانەت ئەم فەیلەسووفە شێتەی بەزۆر لە پێشم لایان دا، نەمتوانی رزگاری بکەم و بیگەڕێنمەوە ماڵەکەی خۆی، هەرچەندە ئەوە لە بەرپرسیاریەتیی من بوو.

لە کاغەزە هەڵگلۆفاوەکانیم ڕوانی، کە بەدزی پاسەوانەکانەوە فرێی دابوون، هەڵم گرتنەوە و ڕازەکانیم کردەوە، قسەیەکم دەخوێندەوە بەشێت نانووسرێت، بۆم دەرکەوت ئێمە مرۆڤەکان لەدەست دەدەین، هەر وەک چۆن پارەکانمان لە چەک بەفیرۆ دەدەین و لە خۆمان زیاتر کەس ناکوژێت، هەروەها ئەو ئامێرانەی لە بەردەم دنیا شانازی بەهەبوونییەوە دەکەین، چون خۆمان دروستی بکەین، کەچی مێری، ئەم هاوولاتییەی وەک کاغەزەکانی هەڵیان گلۆفاند، لە نێوان دێرەکاندا دەڵێت:

– ئەشکەنجەدان لە هیچ ڕۆمانێک ناچێت، چونکە نە سەرەتا و نە لووتکە و نەیش کۆتایی هەیە، نووسینێکی هەرەمەکیی دلڕەقانەیە لەسەر جەستەی قوربانی، ڕۆمانیش بەتێپەڕبوونی کات لە بیرمان دەچێتەوە، هەرچی ئەشکەنجەدانە ئەوا تا مردن لە یادەوەریماندا دەمێنێتەوە و دووریش نییە لە کونیلەکانی جەستەماندا گەشە بکات، ئەشکەنجەدان قەمچی ڕێژکردنی ژیانە لە ناو قەفەسەی مرۆڤدا و بەزۆر ئاخنینی مەرگە بۆ ناو جەستەی، تا بەجۆرێک لە خەیاڵی پڕوپووچی مرۆڤایەتیی ساختە، ڕەها و ڕزگاری دەبێت. دۆزینەوەی کارەبا مەزنترین وانەی ڕۆشنگەرییە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، هەرگیز بەمێشکی داهێنەرەکەیدا نەهاتووە دەبێتە خراپترین هۆکار بۆ لەکارخستنی ئاوەز و گەمەکردن بەشانەکانی.

لە قسەکانی دەگەیشتم، هەندێکیشیان مانایان نەبوو، لێ یەکەمین کلیلی دایە دەستم، تا بزانم من لە چ ئیفلیجبوون و ترسێک دام، من لە شوێنی

هەڵدام، ئەمە شتێکە هیچ گومان هەڵناگرێت، ئەز لە شوێنی هەڵدام و چارەنووسیشم زانراوە، ئەم شێتە پێی گوتم سپێدە (لێرە) بەقەیماغ و هەنگوین لکێنراوە، منیان خستووەتە ناو هەنگوین و قەیماغەوە و نازانم کەی دەمخۆن؟ دەبێ بەر لەوەی بکەومە ژێر چنگیانەوە لێیان ڕزگار بم، ئەوان بەهەستی مەشق پێ کراوی سەگانەیان ناخ دەخوێننەوە، هەڵبەت دارخورماش لە بنپیاڵەدا شین نابێت، وا دیارە لەو ساتەدا ئاسمان وەڵامی دامەوە، زەنگی تەلەفۆنی ژوورەکەم لێی دا و کرینگی ڕۆیشتنمیان بۆ سلێمانی پێ ڕاگەیاندم (کارێکە هەر دەبێ ئەنجام بدرێت).

لە ڕۆژی خۆیدا بەکارەکەم نەزانی، بەڵکو بەپچڕ پچڕ و بەشی نادیار هات، تێگەیشتم ڕاوێکمان لە بەردەمدایە، لێ ئەو ڕاوە نییە باڵندە و دڕندەی تێدا بکوژین، بگرە کـــارێکە ئاتاجی ئارامی و بڕوای لە بالآم بلندترە، من فەرماندەی دەستەکە نەبووم، ئێمە چوار زەلام بووین، ناوی ساختە لە خۆمان دەنێین و گشت شتەکان لە مێشکماندا دەنووسینەوە، من سێیەم کەس بووم لە ناویاندا، ئەوی لەسەرمان بوو چەند کەسایەتییەک لە ناو گروویەکەی تاڵەبانیدا هەن دەبوو بیانکوژین، یەکەم گوتی:

- پرۆسەکە پێویستی بەچەند چاوێک لەوێ هەیە، پێش چەند مانگێک ئێمە لە بەغدا پارەکەمان پێ داون.

کەچی دووەم خەنییەوە و بەفیزێکەوە گوتی:

- ئەوی قسەی خراپ بەسەرۆک بڵێت، ئەگەر بۆ وڵاتی واقواقیش بڕوات سەری لێ دەکەینەوە.

هیچم نەگوت، ئەمە گەشتی ڕاوە و دەبێت ڕاوچی قسان نەکات، نەکو نێچیرەکە بیبیستێت، لە ڕۆژانی باپیر و بابمەوە ئاوا لە ڕاو گەیشتووم، فەرماندەی دەستە لێی پرسیم:

- عەمار شێخ چیتە؟ بەدرێژایی ڕێگە گوێم لە دەنگت نەبوو؟

دەمودەست گوتم:

- گەورەم، بیر لەو چاوانەی ئەوێمان دەکەمەوە، کێ پشتگیری و متمانە بەدڵسۆزییان دەکات، ئەگەر تا ئەم ڕادەیە ناپاک بن، ئەوی زەبر لە کەسوکار و نزیکترین کەسی خۆی بدات، داخۆ ناتوانێت زەبر لەوەی لەسەری ڕێککەوتووە بدات، نەخوازە ئێمە بەلای ئەوەوە (دوژمنی نەتەوەکەیین)؟

بەدڵخۆشییەوە زەردەخەنەیەکی کرد و وەڵامی داوە:

- دڵنیابە، لەمێژە ئەم جۆرە دەناسین، هەموو کات لەگەڵ دیناردا کۆک بوونە، دینار و بەس، ئەمانە قەڵای هەولێریشت پێ دەفرۆشن ئەگەر بیانتوانیایا لە شوێنەکەی هەڵی بگرن.

چوارەم، کە دراو پێ دراوی گەشتەکە بوو، گوتی:

- ئەو دەمی پارەکەم لە دەست وەردەگرن هەست بەخۆشیی جەستەیان دەکەم، کە بەر پارەکە دەکەوێت، ئەو مووچورکەی تەنیا لەگەڵ ئافرەتدا هەستی پێ دەکەین.

وێڕای هەموو ئەوانەی گوتیان، بڕوام نەدەکرد کەسی لەو چەشنە هەبێت، لە نێوان ئاو و باڵندە و درەخت و شینایی ئاسماندا بژێت، کەچی لە پێناو هەندێک دراودا خۆی بەشەیتان بفرۆشێت، بەدەنگێکی کزەوە گوتم:

- خوا دەزانێت.

بڕیارم دا خۆم قوتار بکەم، ئەمەش پێویستی بەزیرەکی و گەمەیەکی خێرا هەیە، نەکو عەفرای ژنم و خێزانەکەم لە دوامەوە ببنە قوربانی، ئێمە بێ چەک هاتین، ئەمەش سەرەتایەکی باشە، پاش چەند ڕۆژێک نارنجۆک و کلاشینکۆف وەردەگرین و شوێنی ئەو زەلامانەش پێ دەزانین، کە بۆ کوشتنیان هاتبووین.

***

هەر دووانمان و پێکەوە لە ماڵێکی خنجیلانەی بناری چیایەکی بڵندا لە شارباژێر چاوەڕێمان کرد، لێمان قەدەغە بوو لەگەڵ خەڵکەکەدا قسان بکەین، لە یەکەمین شەودا کاتژمێر نۆ لە ماڵی فەرماندەکەمان کۆبووینەوە، کەبابمان خوارد و بیرەشمان هەڵقوڕاند، دوای ئەوەی فەرماندەی دەستەکەمان پێی

ڕاگەیاندین (چەک بەڕێوەیە و دەبێت بیانکوژین، تەنیا دوو کەسن دەبێت سەریان لە لەشیان جیا بکەینەوە) گەڕاینەوە ماڵی دووەممان، ئەمەش وەکو فەرماندەکەمان دەیگوت (پرۆسەی ئاگەدارکردنەوەیە بۆ هەر کەسێک وابزانێت لە سزا دوورە)، لە ساتێکی ڕەشی ئەو شەوەدا بەترسێکی گەورەوە ملی خۆم گرت.

دەبوو بەم شێوەیە دابەش بووینایا، هەر دووانە و لە ماڵێک بین دوور بێت لە ماڵەکەی ترەوە، هەلی بیرکردنەوەی پلانێکی دامێ لە سەرەتادا وا دیار بوو شێتانەیە، لێ بڕیارم دا (بیرۆکەکەم) لە کاغەزێکدا بنووسم و لە یەکەمین دەرفەتدا بیدەمە پێشمەرگەیەک، بۆیان دەنووسم ئێمە چین و بۆچی هاتووینە، بەڵکو دەستگیرمان بکەن و یەک یەک بەجیا لێکۆڵینەوەمان لەگەڵدا بکەن، ئەو کات پێیان دەڵێم من وازم لەم پیاوکوژانە و لە هەواڵگرییش هێناوە، بێگومان ئەو کات خۆم لە چنگی ئەم دەزگایە ڕزگار دەکەم، کە دووری خستمەوە لە مرۆڤبوونم و ترس و سامی لە جەستەمدا چاندووە.

لێ هەر زوو هێڵێکم بەسەر ئەم بیرۆکە شێتانەیەدا هێنا، چۆن قوتارکردنی خۆم و خێزانەکەم مسۆگەر بکەم، ئەگەر پیاوانی پێشمەرگە لە لێکدانەوەی بڕیارەکەم بەهەڵەدا چوون؟ خۆ ئەگەر کارەکان وەکو من ویستم بەڕێوە چوون، ئەی چی ڕوو دەدات ئەگەر یەکێک لەوانە بتوانێت بگەڕێتەوە بەغدا و چیرۆکەکەی وەکو خۆی بۆ گێڕانەوە؟ ئەی چارەنووسی ئەو عەفرایەی لەوە ناسکترە، کە بەگوڵ لێی بدرێت، بەکوێ دەگات؟ نەخێر، بڕوا ناکەم پلانێکی باش بێت، بینیم بەخۆم پێ دەکەنم، بۆیە بیرۆکەکەم لە شوێن خۆی لێگەڕا، من بەر لەوەی ئەو کارەی بۆ ئەنجامدانی بۆ سلێمانی هاتووین بەئەنجام بگات، ئێستا بەدەست هەژارییەکی ترسناکی ئاوەزمەوە دەناڵێنم، خەریکە لەو دەمی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای پێ دەکەم، دەبێتە چەند کەرتێکەوە.

ئەوی لێی دڵنیام ئەوەیە، من ئەگەر ناچاریشم بکەن بەشداریی کوشتن ناکەم، ئەوەش باش دەزانم ئەوانیش ئەو کاتە سڵ لە کوشتنم ناکەنەوە، ئەمە شتێکی زانراوە و پێویست بەقسە و باس ناکات (کوشتن بۆ ئەوانەیە فەرمان

ڕەت دەکەنەوە) نەخوازە ئێمە هەر چوارمان لە بەرزترین ئاستی هەواڵگریدا هەڵبژێرراوین.

ئەگەر ژنم نەبوایا ڕەنگە جەربەزەیییەکم لە ژیانمدا بکردایا، خێزانەکەشم زیاد لە شێوازێکی بۆ خۆ قوتارکردن دەدۆزییەوە، بەو حیسابەی نازانن کار و پیشەی من چییە، هەرچی عەفرایە دوای ناپاکییەکەم لە بەرابەریاندا دەستیان لە یەخەی نابێتەوە، دەرفەتێکی باشە بۆ ئەوان ئافرەتێک بەو نازداری و شۆخ و شەنگییەیەوە ببەن، مایەی شەرمیشە بۆ من لێی بگەڕێم ببێتە نێچیرێکی ئاسان و بکەوێتە بەر کەڵبە زەردهەڵگەڕاوەکانیان، پێویستە بیرۆکەیەکی ماقووڵ و گونجاو و خێرا بدۆزمەوە، تاکو بتوانم ڕزگاربم لە چنگ هەواڵگری و ئەوی لە ویژدان و ناو و ناوبانگمدا ماوە.

وەلێ سەرفرازی لە ئەوانەوە هات، دوای ئەوەی چەکمان وەرگرت، فەرماندە داوای لێ کردین هەر کەس و بەتەنیا بڕوات بۆ ئەو شوێنەی چاوەکانمان دەستنیشانیان کردبوو و بیرۆکەیەکیان بدەینێ لەسەر شێوازی تیرۆرکردن، یاخۆ ڕفاندنی داواکراوەکان، ڕۆڵی من لە دوای هەموویانەوە بوو، بەر لە ڕۆیشتنم کۆبووینەوە و دوا پلانمان وێنە کێشا، ئەوی پتر تۆقاندمی پێش ئەوەی بەرەو ماڵی قوربانییەکان بچم کۆبووینەوە و ئەوەی پێ گوتم، کە سبەینێ دەبێ چی بکەین، وام هاتە بەرچاو من هیچ ڕۆڵێکم نییە، تەنیا ئەوە نەبێت بەشداری لە هێرشەکەدا بکەم و هەر دوو زەلامەکە لە دوای یەکی شەو بڕفێنین، لێ فەرماندە لە دوا ساتدا گوتی:

- با عەمار شێخ بڕوات، بەڵکو بیرۆکەیەکی ترمان بداتێ بیخەینە سەر پلانەکەمان، بۆ دەستپێکردن تەنیا ڕۆژێکمان لە کیس دەچێت، تا سپێدەی ڕۆژی داهاتوو ڕێککەوتننەکەمان یەکجارەکی دەبێت.

یەکەم بەکەم زانینێکەوە، کە نازانم بۆ وای گوت، گوتی:

- باشە بۆ عەمار ئەمشەو ناڕوات، تاکو سبەی لەم کێشەیە ببینەوە. بیرتان نەچێت دوای دوو هەفتە بۆ بوڵگاریا دەچین.

بەترسێکەوە هێندەی نەمابوو قووتم بدات، پێم گوتن:

– ئەگەر ئەوە بەباشتر دەزانن لاریم لێ نییە.

ئەو ڕێگەیەی لەسەر نەخشە پێشانیان دام پتر لە جارێک پێیدا تێپەڕ بووم، بەڕێگەوە بووم بەرەو ماڵی دوو قوربانییەکەی بڕیار وابوو سەریان لە لەشیان جیا بکرێنەوە، چونکە جوێنیان بەسەرۆکی وڵات دابوو، هەروەها پاش سەربڕینەکەش دەبوو وێنەیان بگیرێت، تاکو بەرپرسە گەورەکەی بەغدا دڵنیا بێت (ئێمە لە گشت پیاوەکانی دڵسۆزتر و کۆیلەترین).

من بەتەواوی دەمزانی چی دەکەم، گشت شتەکان بەلای منەوە دواییان هات، هەرچەندە دوای ئەم بڕیارەی بەیەکجاری دام ئیتر هەرگیز عەفرا نابینمەوە، بێ دوودڵی لە دەرگەی ماڵی کاکە فەرزادم دا، کە بەگورگ ناوی دەرکردبوو، وا دیاربوو لە کەلێنی پەنجەرەی ژوورەکەیەوە بینیبوومی، هەینێ خاترجەم بوو چەکم پێ نییە، دەرگەی کردەوە و تێی خوڕیم:

– تۆ کێی؟

لەو دەمی بەترسەوە تەماشای پشتەوەی خۆم دەکرد، نەکو یەکێک بەدوامەوە بێت، گوتم:

– کاکە فەرزاد، لێم گەڕێ بابێمە ژوورێ، قسەی زۆر مەترسیدارم پێیە.

وا دیاربوو دەمانچەکەی لە پشتییەوە دانابوو، ئەمەش وای کرد ڕێگەم بۆ چۆڵ بکات، لە کاتێکدا پرسیارەکەی دووبارە دەکردەوە من کێم و چۆن ناو و جێگەیم پێ زانی؟

هەستم کرد ئارەقە بەنێوچەوانمدا تک تک دەهاتە خوارێ، بەر لەوەی بڵێم:

– کاکە فەرزاد باش گوێ بگرە، ئێمە دەستەیەک پیاوی هەواڵگرین، هاتووین بۆ سلێمانی تاکو چەند کەسێک تیرۆر بکەین، لێ من لە دوا ساتدا بڕیارم دا لەوی بۆ تۆ و کاکە ساڵحیان ناوەتەوە ئاگەدار بکەمەوە.

ئەمەم بەخێرایی گوت، چون ڕێگە لە ژیوانبوونەوەی خۆم بگرم لەوەی بڕیارم لەسەر داوە، وا دیاربوو کاکە فەرزاد بڕوای بەقسەکانم نەدەهات، لەو

دەمی کۆڵەکەی لووتی گرتبوو، گوتی:

– گاڵتەم پێ دەکەیت؟ باشە چۆن بزانم تۆ ڕاست دەکەیت؟

لە چرکـە سـاتێکی کـرژبووندا دەنگی ژنەکـەیمان بیـست، لەوە دەچوو بەکوردی لێی بپرسێت، ئەم میوانە کێیە، کە لەم درەنگوەختەدا هاتووە؟ کەچی ئەم شیرلندی بەسەریدا بگەڕێتەوە ژوورەکەی و بنوێت، پاشان سەرنجی ڕووی دام:

– ئەی دەستەکەت لە کوێن، کە بەنیازن من و کاک ساڵح بکوژن؟

شوێنەکەم پێ گوت، پێم گوت چارەسەرێک بدۆزێتەوە من لە دەرەوەی گەمە ئابڕووبەرەکەدا دابنێت، نەکو ژنەکەم و ئەوانی تر خێزانەکەم ببەن، لەو دەمی تەماشای چاویم دەکرد، پێم گوت:

– تۆ بەخۆت دەزانی چ ڕێژیمێک فەرمانڕەواییمان دەکات، دەبێت تۆ و کاکە سـاڵح دەمـودەست کـارەکـە سـاز و ئامـادە بکەن، ئەوان سـیـانن و منیش چوارەمـیـانم، چەکی کـلاشـینکۆف و نارنجـۆکـیـان پێـیـە، ئـەگـەر من لێـیـان دوابکەوم، دوور نییە ڕابکەن و هەست بکەن من زمانم لێ داون.

کـاکـە فـەرزاد هـەر بەڕاسـتـی گـورگ بوو، بڕوام بەخـۆم نەکـرد هەینێ پێی گوتم:

– تۆ یـەکـسـەر بڕۆ، دوای دوو کـاژێر هـەمـوو شت دوایی دێت، ئەگـەر درۆ نەکەیت چەندێک بتەوێت لای خۆمانت دەهێڵینەوە، ئەگەر بشتەوێ بۆ وڵاتێکی تر بڕۆیت پارمـەتیت دەدەین و چیت بوێت بـۆتی دەکـەین، دەی بـەپەلە بـڕۆ بۆ شاربازێڕ.

لە ڕێگە ترسێک دای گرتم لە ژیانمدا نەمدیبوو، کێ نـاڵێت بەدوامـەوە نین، ڕەنگە یەکیان منـی بینیبێت دەچمە ماڵی کاکە فەرزادەوە. کێ ڕزگاربوونم لە چنگیان مسۆگەر دەکات؟ ئەمانە لەسەر زمان لێدان و دووڕوویی و ناپاکی و لە خـەڵک گەیشتن بەتەمـاشـاکردنێک ڕاهێنراون. سـەرتاپای جـەسـتـەم دەلەرزی و لە ترساندا دڵم هێندەی نەمابوو بتەقێت.

کاتژمێر چواری بەیانی لە چاوترووکانێکدا گشت شتێک تەواو بوو، هەڵمەتیان هێنایە سەرمان، ئێمەیان لەگەڵ خۆیاندا برد و هیچ یەکێک لە دەستەکەمان نەیتوانی و پێ ڕانەگەیشت دەست بۆ چەکەکەی ببات، لە یەک کاتدا دە زەلام هێرشیان کردینە سەر و کەسمان جووڵەمان نەکرد، لێ فەرماندەکەمان تەماشایەکی کردم و بەچاو ئاماژەی دا (ئەی ناپاکی پۆخڵ)، خەریکبوو گوێم لە دەنگی بێت، ئەو کاتی لە ترساندا لە بەردەم پیاوەکانی کاکە فەرزاددا سەری دانەواندبوو، کە دەیانشێراند بەسەرماندا و قسەیێلێکیان دەکرد لێیان نەدەگەیشتم، ئیتر زانیم ئەو ئەرکەی بۆ ئەنجامدانی هاتبووین لەبار چوو و کاکە فەرزاد و کاکە ساڵح لە ژیاندا دەبن و تەنیا منیش لە دەستەکەم بەزیندوویی دەمێنمەوە و ئیتر گەشت ناکەین بۆ بولگاریا وەکو خەونیان پێوە دەبینی و چاوەڕوان بوون.

بۆ ئەوەی کارەکە ئاوەز قبووڵی بکات و ماقووڵ بێت، لە تێهەڵدان و ڕیسواکردن و جوێن ڕزگار نەبووم، بەڵکو لەگەڵیاندا دەستیان بەستمەوە و فڕێیان داینە تاقە ژوورێکی بێ ئاو و خواردنەوە، نەمانزانی چەندێک لەو ژوورە ساردە شێدارەدا ماینەوە، دوای ئەوەی کاتژمێرە دەستییەکانمانیان لە دەست بردن و پێیان گوتین مەرگمان زۆر نزیکە.

شارباژێڕ بێ خەم بێدار بووەوە، لەسەر ڕووداوێک نەیزانی چۆن لە کۆتاییی شەودا تەواو بوو و دەزگای هەواڵگری سێ لە هەرە پیاوە دێرینەکانی لەدەست دا و دوای ئەو سپێدە قەشەنگە ئیتر کەس هیچیان لەبارەوە نازانێت.

## محەمەد جەمیل سوێرکی

دەمودەست ناسیمەوە، سیمایم باش لەبیرە، ناوی (عەباس خەلیل شناوە)یە و کابرایەکی تا بڵێی سادە و ساکار بوو، لە بەغدا دارتاشیی دەکرد، لە زینداندا لە ژوورەکەی منیان دانا، بەدرێژاییی چوار ڕۆژ زاری هەڵنەهێنایەوە، تاکو دڵنیا و خاترجەم بوو، کە من وەکو ئەو دەستبەسەرم و لەوانە نیم بخرێمە نێوان گیراوەکانەوە، تاکو نهێنییەکانیان بزانم و زمانیان لێ بدەم.

مافی خۆیەتی قێزیان لێ بکاتەوە، چونکە ئەو هیچ چەکێکی نەبوو، تاکو بەرەنگاریان بێتەوە، هیچی بەدەستەوە نەمابوو ئەوەندە نەبێت (بێز لە ڕەفتار و سیما و قسەکانیان بکاتەوە)، هەتاکو خوا ڕێگەی ڕزگاربوونیان پێ نیشان دەدات، ڕێگەشی دا.

عەباس خەلیل شناوە لە سیاسەتەوە دوور بوو و توخنی ئەو قسانە نەدەکەوت، کە بەحزبەکان دەکران.. ڕەنگە لە جیاوازیی نێوان دیکتاتۆری و دیموکراسی گەیشتبێت، بەڵام ناتوانێت ئەو وشانە دەربڕێت، لەوانەشە هەر نەیەوێت قسانیان لەبارەوە بکات، چونکە بەلای ئەوەوە لە جلەکانی پانوپۆڕترن و شیاو نییە لەبەریان بکات، یاخۆ شانازییان پێوە بکات.

بەتام و بۆو و هەڕەمەکییانە باسی ژیانی خۆی دەکرد، ئەم پیاوە لەبارەی خۆیەوە دەیگوت، دەتوانێت ژوورێکی وا لە تەختە دروست بکات، جوانییەکەی ناچارت بکات تێیدا بمێنیتەوە، هەروەها دەتوانێت ماڵە لاچەپەکەت بکاتە مێرگێک لەودیویەوە ڕووبارێک ببینیت ڕێ نەکات و ماسییەکانیشی ڕاو نەکرێن، ئەو دارتاشە دەستڕەنگینەیە گەڕەکی باب ئەلشێخ لە منداڵییەوە دەیناسن، ئەو ڕۆژانەی لەگەڵ باوکیدا کاری دەکرد، کە ئەویش ئەم پیشەیەی لە باوکییەوە بۆ مابووەوە. بەسەدان کورسیی دروست کرد، لێ بەتێپەڕبوونی

کات هاوەڵەکانی دەیانگۆڕی، عەباس خەلیل شناوە دەیگوت (دانیشتن لەسەر یەک کورسی دەبێتە ئەگەری نەخۆشیی لەبیرچوونەوە و مایەسیری) ئەو نوکتە پاکەش، کە هیچ مەبەستێک لەودیویەوە نەبوو، گەیاندییە زیندانەکانی هەواڵگری و ئاسایش و بێ ئەوەی بزانێت تۆمەتەکەی چییە، دوو ساڵی تێدا بردنە سەر، هەینێ پێش دەرچوونی پێیان گوت، خەمۆکی و داغ و ژان و تووڕەیی و ڕق و کین و (قێزهاتنەوە) تا ئەمڕۆ بەریان نەداوە.

***

ئەم زەلامە ترسنۆکە، کە لە ژێرزەمینەکانی هەواڵگریدا زۆریان ماندوو کرد و ئەشکەنجە دا، دوای حەوت ساڵ توانی بگاتە عەمان و لەوێشەوە بۆ بەیرووت، لەوێ لە گەراجێکدا بینیم چای دەفرۆشت، وەلێ هێشتا پیشەی دارتاشی خەونی بوو و دەیویست دووبارەی بکاتەوە و تێیدا بژێت، لەوێدا دەستڕەنگینییەکەی و ڕەنگە ژیانیشی خۆی تێدا حەشار داوە، لێ ئەو کەشتییانەی ڕەشەبا بەلەسە و یاخیکردن قوتاریان نەکرد، هیچی بۆ نەمایەوە بەرەو یۆنان کۆچی کرد، تا لەوێدا خۆی بینییەوە، کە بەدوایدا دەگەڕا، گەڕایەوە سەر کارەکەی و دوای ساڵێک توانی کچێکی ئیتاڵیی بەڕەگەز لبنانی بخوازێت، کاتێک لە بەیرووت بینیم، کە لەگەڵ ژنەکەیدا بۆ سەردان هاتبوون، سەبارەت بەژیانی پرسیارم لێ کرد، گوتی:

– من هێشتا لە دۆخی دوورکەوتنەوە و بێزلێکردنەوەدام لێیان.

دوایی قۆڵی گووشیم و هاتە قسان:

– ئەو نەفرەت لێکراوە ملی شکاند، ئیتر نە دەیبینین نەیش لەبارەیەوە دەبیستین، نە دیواربەندی شەقامەکان و نە پەیکەر و ئامۆگاریی نەخشێنرا و لەسەر سیرامیک، هەروەها زبڵدانەکانیش بەشی خۆیان لە وێنەی دڕاو برد، تەلەفزیۆن دەنگوباسی جیهان بێ لێ قرتاندن و سانسۆر پەخش دەکات، وامان لێ هات گشت کەناڵە ئاسمانییەکانی ڕۆژهەلات و ڕۆئاوا دەبینین، گوێمان لێ دەبێ و دەبینین چی لەبارەی ڕۆژە مەزنەکەی خۆری تێدا هەڵهات دەگوترێت، کە دوای ماڵئاواییەکی خەمهێنەر لە ساڵی ١٩٦٨ـەوە دای گرتین

و هێند ئارامەمان گرت، تاکو ئارامییش بەدەستمانەوە شەکەت و ماندوو بوو و ئەو ڕۆژە هات، کە بەتاسە و فرمێسک و قوربانییەوە چاوەڕوانی بووین. سەردەمی کوشتن و ئەتککردنەکان بەسەرچوو، ئەوەیشی بۆ مەرایی و ڕیایی ناوی فەرمانڕەوای بەکوڕەکانی ئەو دا، لە شەرماندا لەودیو دیوارەکانەوە گۆشەگیر بووە، لەبەر ئەو ڕیسواییەی ئەوانە دەرگیری بوون، کە ڕووڕەشی و خراپەکارییان بۆ ماوەتەوە، هەرچی ئەو شاعیرانەشن، کە تێربوون لە بەخشینەکانی پیاوکوژەکە، ئەوانە لە ترساندا بەجلی ژنەکانیانەوە کلکیان نایە ناو گەڵیانەوە و هەڵاتن.

***

نازانم چەند عەباس شناوە بوونە قوربانیی نوکتەیەک، کە مەبەستیان نەبووە و بەشتی تر لێکیان نەداوەتەوە؟ بەڵکو بەهەڵەش وتوویەتی بێ ئەوەی ئاگای لەو سەگوسوالانە بێت، کە ڕق و کینە لە هەر بستێکی ئەم وڵاتەدا بڵاو دەکەنەوە.

وێڕای تێپەڕبوونی بیست ساڵ بەسەر دەستگیرکردن و دەستدرێژیکردنە سەر ژنەکەم، هێشتا ئەو ڕۆژانەم باش لە یادە، کە لە ژێر کەڵبە ڕەشەکانیاندا بووم، بمرم مەجید سەعدوونم بیر ناچێت، کە بەبێ ئەوەی تاوانێکم هەبێت فڕێی دامە گرتیگەکانی ژێر بەغداوە، تاکو بەژنەکەم ڕابوێرێت و تۆمەتی ناپاکیکردنی دامە پاڵ، هەر بۆ ئەوەی ماوەی کوشتنەکەم و ڕابواردنەکەم درێژە بکێشێت، ئەمە چ وڵاتێکە؟ داخۆ خەڵکەکە چۆن لەگەڵ ئەو ترس و تۆقینە ڕۆژانەیەیان هەڵکردووە، کە لە قوتابخانە و ماڵ و شەقام و چایخانە و شوێنەکانی خواپەرستیدا بەدوایانەوە بوونە؟

ئەز ئەوە دووپات دەکەمەوە، کە عەباس خەلیل شناوە دەیگوت، هەر جارێک هەواڵێک بخوێنمەوە، یاخۆ ببیسم چییان بەسەردا هاتووە، قێزیان لێ دەکەمەوە و لە پەروەردگار دەپاڕێمەوە دۆزەخ و خراپترین چارەنووسیان پێ نیشان بدات.

داخۆ بۆ سزادانیان لەسەر ئەوەی کردوویانە دۆزەخ بەسە؟ بڕوا ناکەم.

## عەمار موزهر شێخ

بێ نان و ئاو ئێمەیان توور هەڵدایە ژوورێکەوە بۆنی پیاز و تەپاڵەی لێ دەهات، گوێم لێ بوو فەرماندەی دەستەکەمان دەیگوت:

– عەمار شێخ ئاخری کاری خۆت کرد.

بێ ئەوەی لێی بترسم بەسەریدا شیراندم:

– بێدەنگ بە، ئەگەر زمانم لێ بدانایا ئاوایان تێ هەڵنەدەدام، لەبری گومانکردن لە من بیر لە ڕێگەیەک بکەرەوە لەم ئاریشە گەورەیە قوتار بین.

دەنگە توندەکەم تا ڕادەیەک بێتاوانیی دەگەیاندم، یاخۆ هیچ نەبێت دەنگە سەرکێشەکەم هەندێک بێتاوانیی پێ بەخشیم، کە بەڕووی ئەوانی ترەوە هەستم پێ کرد، یەکیان گوتی:

– بەڵێ، زۆریان لێ دا، پاشان ئەم گومانە چییە لێی دەکەن، لە کاتێکدا مێژوویەکی لە دەزگای هەواڵگریدا هەیە؟ دەبێت بیر لەوە بکەینەوە کە دەیڵێین، وای دەبینم مەرگ لە دەرگەی هەمووماندەدات و جیاوازیمان ناکات.

وێڕای ئەمەش فەرماندەکەمان دیسانەوە گوتی:

– عەمار فریوی داین، لەوانەی دەیڵێت بڕوا بەیەک قسەی ناکەم، ماوەیەکی کەم نییە ڕاپۆرتم پێ دەگات، دەڵێت (عەمار بۆ هەواڵگری دەست نادات)، ئێمەش بۆیە لەگەڵ خۆماندا هێنامان، تاکو ڕاستیی ئەوەی نووسراوە دەربخەین، ئەوەتا ناپاکە ئاخری کردی.

ئەگەر وەک ئەوان دەست و پێم نەبەسترایەتەوە، ئەوا هەڵمەتم دەبردە سەر فەرماندەکەمان، تاکو لای ئەوانی تر بێتاوانیی خۆم نیشان بدەم، کێ دەزانێت، دوور نییە یەکیان بتوانێت خۆی ڕزگار بکات و بگەڕێتەوە بەغدا،

ئەمەش شتێک نییە ئەستەم بێت، لێ بەجوێندان پێی وازم لێ هێنا و بەهەمان دەنگی بەرز دووپاتم کردەوە:

– ڕێگەت پێ نادەم، من لە تۆ و لە گشت بنەماڵەکەت پاکترم.

پێش ئەوەی شەڕ لە نێوانماندا هەڵگیرسێت، سێ زەلام هاتن و فەرماندەی دەستەیان برد، دوای نیو کاژێر منیشیان برد و ئیتر نەمزانی لە پشت منەوە چی بەسەر ئەوانی تردا هاتووە، لێ کاکە فەرزاد بزەیەکی کرد و گوتی:

– خاترجەمبە، هەموو شتێک تەواو، تۆ بەلای ڕێژیمی بەغداوە دواییت هات، وەک چۆن ئەوانی تر دواییان هات، هیچ ترسێک لەسەر ژنەکەت نییە، بگرە وەکو ژنی قارەمانێک مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت، کە بووە قوربانیی ئەو ئەرکەی پێی سپێررابوو.

لەگەڵ کاکە ساڵحدا بەئۆتۆمۆبێلەکەی چووین بۆ خانوویەکی خۆش لە دامێنی چیایەک بەدارگوێز داپۆشرابوو، پاسەوان بەچەکەوە دەیانپاراست، چووینە ژوورەوە، نیگای ڕێز لێگرتن وەکو گوڵباران بەسەرمدا دەبارین، گوێم لێ بوو کاکە ساڵح دەیگوت:

– تۆ لەم ژوورەدا دەمێنیتەوە، تاکو شوێنێکی گونجاوت بۆ دەدۆزینەوە، هیچ ترست لەسەر نییە، چیشت بوێت یەکسەر بۆت دێت.

بەدەم ئاماژەکردنەوە گوێم لێ بوو بەیەکێک لە زەلامەکانی گوت:

– کاک فەرهاد، کاک عەماری برادەرمان میوانە لاتان، تاکو دەیگوازینەوە شوێنێکی تر، دەمانەوێت چی دەوێت بۆی جێبەجێ بکەن و چاوتان لێی بێت.

وادیار بوو کاکە فەرهاد بەرپرسی ئەو ماڵە گەورە پەنهانە بوو، ئەوە یەکەمین جار بوو بۆنی پونگە بکەم، کە لە فەرهادەوە هات، ئەو دەمی بەڕێزەوە سەری نەوازشی دانەواند:

– ئەم جوامێرە شایانی زۆرە لە ئێمەوە، کاک ساڵح دڵنیا بە، مادام میوانی منە دڵت لای نەبێت.

بەر لەوەی کاکە ساڵح بڕوات، بەتوندی باوەشی منەتباری لێ دام، لای

دەرگەکە دەستی گووشیم و گوتی:

– لەمــڕۆوە دەتوانی بێ ئەوەی خــەونی ناخــۆش ببــینیت بنوویت، ئەوان کۆتاییيان پێ هات و کەس بەوەی ڕووی دا نازانێت، تۆش بەنیسبەت بەغداوە لەگەڵیاندا مردوویت، کاکە عەمار من مەمنوونی تۆم.

دوای چەندین ساڵ لە قاتوقڕی و کارکردن لە بواری کوشتن و زمانلێدان و ئەشکەنجەدان و نووسینی ئەو ڕاپۆرتانەی بێ لێپرسینەوە ملی خــەڵکیان دەشکاند، ئەو شەوە، یەکەمین شەو بوو لە ئاسمان و ئەستێرەکان ڕادەمام.

کەبابم خوارد، کە شارەکانی باکور پێی ناسراون، بەوە لاپەڕێکی ڕووتەنم لە دڕندەیێتی جەلادان هەینێ چێژ لە داخکردنی بێتــاوانان وەردەگــرن لە ژیانمدا پێچایەوە، قسەکەی عەباس ئەبوتەبرم باش لە بیرە کاتێک بەیەکێک لە گیراوەکانی ڕادەبوارد:

– کوڕی سەگ ئەگەر دانی پێدا نەنێیت، لەم گۆشتەت باشترین کەباب چێ دەکەم.

نەمدەتوانی پاروە کەبابەکەی لە نێوان ددانەکانمدا بوو قــووت بدەم، ئەو پێستە دەباغکراوانەم هاتنەوە بیر، کە ناچاریان کردم تەماشایان بکەم، تاکو وەک ئەوانم لێ بێت و هەستم بمرێت.

لە ژوورەکەم دەرچووم، لە ژێر ساباتێکی شێدار و نسرمدا پیاسەم دەکرد، بەیەکێک لە چەکدارەکانم گوت:

– دەتوانم بیرەیەک هەڵدەم؟ بەڕاستی ئەگەر نەخۆمەوە نازانم چۆن بنووم.

لەوی گوتم ڕاستگۆ نەبووم، لێ لەو کاتەی شەودا هەستم بەپێویستییەکی سەیری بیرە نۆشین کرد، دوای نیو کاژێر بینییانم سندووقێک بیرەیان هەڵگرتووە و لەودیو دەرگەی ژوورەکەمیان جێهێشت و دەستیان بەرز کردەوە و سڵاوی سەربازییان بۆ کردم، ئەوجا لە نێویاندا هەستم بەگرینگیی خۆم کرد، هەرچەندە ئەو دەمی تکای بیرەخــواردنەوەم لێ دەکــردن، هەستی شەرمەزاری کردبوومی بەتەنەکەیەکی قووپاو.

گـوێم لە قـیـرەی قـەلەڕەشـێک بوو لـە دوورەوە دەهات، من لـەو جـۆرە نـیم بەدەنگی قـەلەڕەش ڕەشـبـینی دام گـرێت، لێ لەو کـاتانەی سـەرەتـای شـەودا، سێ قوتوو بیرەم خواردبووەوە، هەسـتم بەترسێک لەسـەر عەفـرا و خێزانەکەم کرد، کەوتمە بیرکردنەوە:

چی ڕوو دەدات ئەگەر یەکێک لە ناو ئەمانـەدا لەو زمان لێدەرانە بێت، کە لە بەرابەر سیحری دیناردا دەلەرزن؟

نازانم قیرە قیرِی بۆق لە کوێوە دێت، هەرچەنـدە ئێمە لە قەدپاڵی کێوێکداین نە ئاو و نە جۆگەی لێیە، ڕەنگە قیرەی بۆق نەبێت وەک من بۆی چووبم، بەڵکو هێمـای دەنگیی ئاوازدار بێت، دووریش نییـە دوای چوارەمین بـوتڵ چی دەنگ هەیە خـۆیان بەمێشکمـدا بکەن و چی شـتـی پڕوپووچ هـەن گـریمـانەی بکات، دوای ئەوەی ئـەو دەسـتــەیەم دایە دەسـتــەوە و فـرێم دانـە چارەنـووسـێکی دڵتەزێنەوە.

***

نەمزانی کـەی و چۆن کـەوتمە ئەو خـەوە قـووڵەوە، کە هـەشتی بـەیانی لەبەر دەرگـە کوتانێکی هێمنانەدا بێدار بوومـەوە.. سەیرم بەو شـوێنەدا هاتەوە، کە منی لێیم، چون دوێنێ نەمبینیبێت، دەرگـەکەم کردەوە، یەکێک لە پاسەوانەکان قاوەڵتیی بۆ هێنام، گوتی:

– کاکە عەمار بەیانیت باش.

سینییە خـواردنەکەم لێ وەرگـرت و سـەرم بۆ دانەواند و دووپاتم دەکـردەوە (سـوپاس)، تاکـو لە چاو ونبـوو، مـیـزم کـرد و دەست و دەمـوچاوم شـوشت، ئینجـا پەردەی ژوورەکەم لادا، بەتامـترین بەرچاییم لە ژیاندا بینی، ڕەنگە زۆر برسـیـم بووبێت بۆیە، لێ هـەرگـیـز هـێلکەی کـوڵاو و مـاسـتـی وەک ئەمـەم نەخـواردووەتەوە، هـەروەهـا ئـەو کـولێرە گـەرمـەی لە هـی بەغـدا ناکـات، گـشت ئەمـانە بەڕادەیـەک خـۆشـیـیـان پێ بەخـشـیم ئاواتم دەخـواست لە پێناوی قاوەڵتییەکی ئیمپراتۆرییانەی وادا هـەر لێرەدا بمێنمەوە.

له ساتێک له زەمەنی ڕزگاربووندا، بیرم لەم ژیانەی خۆمان کردەوە، کە پڕە له کوشتن و شێواندن، هەروەها بیرم لەو حەزە نەخۆشانە کردەوە، کە تێیاندا لەگەڵ کەسایەتییلێکی تەباشیریدا ژیام، هیچ ئەدگارێکی مرۆییانەیان نەبوو، چۆن ئەو هەموو ساڵەم لەسەر دار و پەردووی خۆمدا بەسەربرد، له کاتێکدا ڕۆژ بەڕۆژ لە مرۆڤایەتییەکەی جیا دەبێتەوە؟ چ ژیانێکی ژەنگاویی له چوارچێوەنراوە بەژووره ساردوسڕەکان و ناڵەی ئازارچەشتووان، ئەی چۆن توانیم پێستی مرۆڤەکان ببینم بەبەرچاومەوە وەکو پرتەقاڵ پاک دەکران؟ چ سەرگەردانییەک بوو منیان پەستایە ژێر باڵەکانییەوە و چ ئارەزووکردنێک بوو بەڕابواردن و سەفەرەکانی فریویان دام، هەروەها بەو پارەیەی له ئاسمانەوە بێ ئەژمار بەسەر ئەوەدا دەباری، کە پتر سەر بەدەسەڵاتی پیاوکوژییە؟

لەسەر ڕیقنەی شەمشەمەکوێرە و خوێنی مەییودا بووم، ڕۆژەکانم بەڕێ دەکردن و بەسەدان کەسم دەبینی له جەلادەکەیان دەپاڕانەوە ئیتر پەراسوویان نەشکێنێت و گیانیان داخ نەکات، دوای هەر وشەیەکی (من بێتاوانم) قامچییەکانیان توندتر دەبوون و سەرگەرمیی دانیشاندنمانیان لەسەر سۆیە زیاتر دەبوو و گۆشتی پاشەڵ لێ دەبووەوە..

ساڵانی من لەوێ چەند ژەنگاوی بوون، بێ ئەوەی هاوار بکەم، یاخۆ نارەزایی دەربڕم، ئیتر له نێوان خۆم و ویژدانی خۆمدا کەوتمە دادوەری و له تاواندا له (انا لله وانا الیه الراجعون) بەولاوە هیچم پێ نەما، تا هەر نەبێت بەو چەند وشەیە ئاگری کڵوکۆ دامرکێنی دەمارەکانم نەختێک خاو بکەمەوە و ڕوحیشم، کە بەئاستەم نووزەیەکی پێوە مابوو بەزیندوویی بهێڵمەوە.

– بمبوورە عەفرا، ناچار بووم ئەوەم کرد، دەبێت لەم دۆزەخە هەڵبێین، مەگەر ئەوی بەئاگرەکەی داخ بووبێت پێی بزانێت، بمبەخشە ئازیزم، نامەوێت بەردێکی بێ مانای شەترەنجی پیاوکوژان بم.

چون بەیەکجا ڕابردوو بشۆمەوە جارێکی تر دەموچاوم شوشتەوە، عەفرا له ناو سەرم دانیشتبوو و ڕەتی دەکردەوە له کۆڵی بیر و یادەوەرییەکانم بێتە خوارێ، هەموو کات بەتووڕەیییەکی گرکان ئامێزەوە تەماشای ڕابردوو

دەکەم، چۆن وێنەمیان لە نێو خەڵکدا شێواند و چۆن ناوی من ترسی لە دڵی بیسەردا دەڕوێنێت، لە کاتێکدا من تاکو ئێستاکێش ناتوانم مریشکێک سەربڕم، یاخۆ مێروولەیەکی سەر ڕێگە پان بکەمەوە.

هەڵبەت ئێستا، کارێکی باشم کرد و ڕوح و ویژدانی خۆم لە وێرانەیی قوتار کرد، سبەینێش چیم بەسەر بێت ئەهوەنترە لەوەی لەوێ بمێنیتەوە، لە نێوان گریەی ئازارچەشتووان، کە شەو و ڕۆژ بەسەرمدا دەدات.. مێرییە شێت ڕاستی دەکرد، هەینێ پێی گوتم تۆقین نزیکترین زاراوەیە لە بێدەنگی و لاڵییەوە، ترس قسە دەدزێت و زمان دەکوژێت، لە کوێ ترس هەبێت زەحمەتە بۆمان وتووێژ لەسەر بوونی مرۆڤ بکەین.

داخۆ، ئەو قسانەی خزەیر مێریی فەیلەسووفی شەماعیە دەیکردن لەسەر بنەمای شێتی و بیری خۆیەوە دەیکردن، یاخۆ قسەی نەستەق ئەزبەر دەکات و دەیگێڕێتەوە و دووبارەی دەکاتەوە گوایا لە سرووشی ئاوەزی خۆیەتی، کە بەسەر نهێنییەکانی گەردووندا کراوەتەوە؟

جارێکیان پێی گوتم (ئێمە دێینە دنیاوە وا دەزانین کامەرانی لە وەرگرتنە، پاشان بۆمان دەردەکەوێت کامەرانی لە بەخشیندایە)، دووەم جاریش پێی گوتم (نەزان دوژمنی خۆیەتی، ئەی چۆن هاوەڵیی یەکێکی تری پێ دەکرێت؟)، ئیتر نازانم ڕاستیی ئەم قسە چەورانەی لە کوێوە دەهێنا؟ یا هی خۆین، یانیش لەملا و لەولا پێوەی ناوە و کەس هیچی لەبارەوە نازانێت. ئەمە گرینگ نییە، لێ دەرگەی کلۆمکراوی خستە سەر گازی پشت و توانی مکوڕم بکات لەسەر ڕزگارکردنی خۆم لە ماڵوێرانی، تا ئێستاش دڵنیام، بێگومان بێ ئەوەی پێ بزانێت، پیچێک ئازایەتی و نەخشەدانانی پێ دام بەشی ئەوەی دەکرد کە کردم، چونکە ئەو بەخۆی پێی گوتم:

– لە ناو هەر بیرۆکەیەکی پێشوەختەدا، تاکو تێیدا هەڵبکەیت، هیچ مانایەک بۆ ژیان نەماوەتەوە، بۆ ئەوەی بژین دەبێت بڕوا بەوە بێنین، ژیان ئەوەیە هێشتا نەمانگوزەراندووە و هەردەم لە بەردەمماندایە.

دەبێ ئێستا لە کوێ بێت؟ داخۆ وەکو فەرمانم پێ دان گەڕاندیانەوە ماڵ؟ یاخۆ بۆ حەزی خوێناویی خۆیان لێی گەڕان، تاکو بەخۆی و بەقسەکانی پێ بکەنن، کە لە تووتییەک دەچوو مەیی نۆشیبێت، ئەم بوونەوەرە لە گشت کەسێکی ئەم سەرزەوییە نەویستراوە، چونکە ئەوی نەوترێت ئەم دەیڵێت، لە هەموو جارێکیشدا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە ئاودەست بۆ ئەوە چێ کراوە، تاکو لە بێمانایی ژیانمان ڕابمێنین، نەک بۆ ئەوەی پیسایی تێدا بکەین، هەڵبەت ئەگەر قسەیەکی وا بکات، ئەوا بێبەزەییانە لێی دەدەن، کەچی ئینجاش دووبارە بزەیەک دەکات لە بەرابەر ئاودەستەکەی بۆی دەیسەلمێنێتەوە بەڕاستی ژیان ئەوەیە، کە هێشتا نەژیاوین.

***

چوار ڕۆژ تێپەڕی، هێشتا من لەو ژوورەدام، کۆمەڵێک چەکدار لە دەورمدان و چییان لێ داوا بکەم بۆمی جێبەجێ دەکەن، لە نێویاندا خۆم وەکو پاشایەکی بێ تاجی بەئەڵماس و ئاڵتوون نەخشێنراو هاتە بەرچاو، کاکە فەرهاد جارێک سەری لێ دام و پرسیاری ئەوەی لێ کردم داخۆ لەم شوێنەدا بێزار نەبوومە، پێم گوت:

- من لە بەهەشتدام برا، تکام وایە تاکو پەروەردگار ئیزنی ڕزگاربوونی ئەم وڵاتە کۆستکەوتووە دەدات، من لێرە بم.

کەچی ئەو وەک ئەوەی گشت نهێنییەکان بزانێت، بەپەلە گوتی:

- کاکە عەمار، تەنانەت ئەگەر ڕێژیمیش برووخێت تۆ ناتوانیت بگەڕێیتەوە بەغدا، تۆ بەخۆت دەزانیت لەو کەسانەیت لای خەڵکەکە نەفرەتیان لێ کراوە، (وەکو دەڵێن) بەدەیان زیندانیت لە ژێرزەمینەکانی هەواڵگریدا کوشتووە.

لێ من ویستم خۆم پاک بکەمەوە، گوتم لێ بوو دەیگوت:

- ئێمە دەزانین تۆ کێیت، تکایە خاترجەمبە، دوای ڕووخانی دیکتاتۆر ژنەکەتت بۆ دێنین، ئیتر ئارەزووی خۆتە لێرە لە کوردستاندا بمێنیتەوە، یاخۆ کۆچ بکەیت بۆ هەر وڵاتێک دەتەوێت.

پاشـان لە ژێر پارێزگـاریی پیـاوەکـانیـدا گـەشـتـێکی تایبـەتی بۆ ڕانیـە و دووکـان و پـێنجـوین بۆ ڕێکخـسـتم. ئەو کـات زانیم بـەهەشت ئەو شـار و ئاواییانەن، کە پێیاندا ڕەت بووین، هەر بەڕاستییش ئاواتم خواست تا مردن لە شاربازێڕدا بمێنمەوە.

## سەفیە

نەمتوانی بنووم، تارمایی حەجاوی بەدوامەوە بوو و بەردەوام دەیگوت (خوا یارمەتیت بدات عێراق)، وەکو شێتەکان لەگەڵ خۆمدا دەدوام، کاتژمێر پاش نۆیە، شەویش تژییە لە کوتان بەدەرگە و پەنجەرەکاندا، کە بەرگوێم دەکەوتن، کەسیش نەبوو لە دەرگە بدات، ڕەنگە باران بێت بەر شووشەی پەنجەرەکان بکەوێت، جەستەم لەسەر پێخەفە نەرمەکە بەرز کردەوە و بڕیارم دا بچمە گەرماوەکەوە و لە ژێر ئاوی دووشەکەدا بمێنم، یان لەوانەیە تابەیانی لە بانیۆکەدا بمێنمەوە.

لە مانەوە لە ژێر ئاودا هەستم بەترس کرد، ئەوە یەکەمین جار بوو لەبەر پریشکی ئاوە گەرمەکەدا هەستم بەترس دەکرد، لەوێ لە گەرماوەکەدا گوێم لە هیچ نەدەبوو، ڕەنگە دنیا کاول بووبێت و من ئاگام لێ نەبووبێت، بۆیە بەترسەوە لە بانیۆکە دەرچووم، لە دوورەوە دەنگی تەقەم دەهاتە بەرگوێ، وا دیارە لەو شوێنەی منی تێدا دەژیم نزیک بووبێتەوە، گڵۆپەکەم کوژاندەوە و لەودیو پەنجەرەکانەوە دەمڕوانی، لە گۆشەیەکەوە دەچووم بۆ گۆشەیەکی تر، دڵنیا بووم یەکێک بۆ دزی هاتووە، لە دەرگەی ئەپارتمانەکە دڵنیا بووم، کە بەو ناشکێت، کەچی ئینجاش ترس خۆی بەجەستەمدا کرد، من لە منداڵییەوە لە دز و سەگ دەترسام، کەوتمە بیرکردنەوە:

ئەم باڵەخانەیەی منی تێدام پڕە لە خەڵک، چۆن دەتوانن شتەکانی بدزن لە کاتێکدا خاوەنەکانی پاسەوانیی دەکەن؟

خۆم لە گۆشەیەکدا وەکو ژیژک گرمۆڵە کردبوو، لەو کاتەدا ڕۆژانی شەماعیەم بیرهاتەوە و پرسیاری ئەو ئافرەتەم کرد، کە لە دز دەترسێت و دە ساڵی ڕەبەق لە ژێر چەپۆک و لە نێو کەمتیاراندا ژیا؟ مۆمێکم لە ژووری

نووستندا هەڵکرد، بوێریم بەسەر خۆمدا کرد و لەو بۆشاییی ترس و سامەم دەرهێنا، دیسانەوە چوومە لای یەکێک لە پەنجەرەکانەوە و بەشێوەیەک چون دزەکان بەکەم بزانم پەردەکەم لادا، دەبینم تەرمێک لەسەر شۆستەی باڵەخانەکەماندا فڕێدراوە، ئەو تەرمە بەر لە کەمێک، کە لە پەنجەرەکەوە تەماشام کرد لەوێ نەبوو، خوێنێکی زۆری لەبەر ڕۆیبوو، لێ کەس لە دەوروبەری نەبوو، جارێکی تر ترس کەوتەوە قەپاڵگرتن لە جەستەم، من لە منداڵیمەوە لە دز و سەگ و تەرم دەترسم، ئیتر گشت هۆیەکانی ترسانم بۆ دروست بوون.

کاژێرە چاڵمەکەی ژووری نووستن پێم پێ دەکەنی، لە شوێنەکەی خۆی هەڵم گرت و لە ژوورەکەی ترم هەڵواسی و دەرگەم لەسەر داخست، دەزانم ئەم ئەپارتمانە پاکترە لە ماڵەکانی نهۆمی خوارەوە، مار و مێرووی نییە، لێ هەستەکانم دەڵێن (مشکێک بەدەورمدا دەخوولێتەوە)، ئەوەتا خەریکە دەیبینم، چەند جێگەی ترسە کەسێک تەنیا خۆی لە شوێنێکی چۆڵی وادا بێت، نەخوازە مشکێکیشی لێ بێت بەخێرایی لە نێوان مووبەق و گەرماو و ژووری نووستندا تەراتێن بکات.

من خۆم هەر لە منداڵیمەوە لە دز و سەگ و مشک و تەرم دەترسام، پێستەم بەدڕکوداڵ و وێرانە دەرزیئاژن کراوە، ئەو هەستە ئازاردەرە هەردەم بەلەشمدا تەزووی دەکێشا، لە شێوەی ئەو خوێنەی، کە بەناو دەمارەکانی جەستەمدا هاتوچۆی دەکرد. لەودیو دیوارەکانەوە گوێم لە دەنگی کاتژمێرەکە بوو لێی دەدا، وێڕای ئەوەی دنیای دەوروبەرم پڕ بووە لە بارووت و ئاگری گڕکان، کەچی زرنگەی کاتژمێرەکە لەوان پتر بێزاری دەکردم، ئەمە سەرەولێژییەکی زۆر ترسناکە ئاوەزم دەیگرێتە بەر، کە خەریکە دەتەقێت، ڕەنگە شێتی زەفەری پێ بردبم، دوای ئەوەی بەدرێژاییی دە ساڵ لێی دەتۆقیم، لەو ماوەیەدا من لە نێوان تەلدڕەکانیدا بووم، خۆی بەیەکە یەکەی کونیلەکانی پێستمدا خشاند و نەیتوانی بێتە ژوورەوە، دادەبەزمە بیرێکی جێهێڵراوەوە، هەناسەم لەبەر بڕاوە و بەدووی کۆمەڵێک شێتەوەم، ئەوانیش لەگەڵمدا دادەبەزنە بیرەکەوە،

جەستەیێلی سووتاو و بەخەڵووز بوو ئەو ئاگرەی لە جل و گیانیان بەربووبوو هێشتا نەکوژابووەوە، کۆمەڵەکە بەدەوری بیرەکەدا دەخوولانەوە، هەر یەکێک لە ئێمە چاوەڕێی دەکرد بگاتە ئەوسەری، چەکوشێک دەیدا بەسەرماندا (نۆرەی تۆیە دابەزیتە بیرەکەوە)، هەرچەندە من بەر لە هەموویان ڕێگەی دابەزینم گرتە بەر، بێ ئەوەی کەس چەکوش بەکەللەی سەرمدا بکێشێت.

ئەوە گۆڕ بوو یاخۆ بیر من بۆی چووم؟ ناوانم، گوێم لە زرنگەی کاتژمێرەکەیە لە دەم بیرەکەوە دێت، هاوار دەکەم:

- ئێستا نا.. ئێستا نا..

یەکێک دەبینم دەرگەی دووکانەکەی دەکاتەوە و دەڵێت:

- بەخێربێیت سەفیە، ئێمە بەتاسەوەین بۆت.

منیش لە منداڵیمەوە لە دز و سەگ و مشک و گۆڕ و تەرم دەترسم، چی ماوەتەوە تاکو بەدەر لەم ترسە بژیم، کە دەمباتە مەملەکەتی شێتییەوە؟

## ئەمین هاشم بەیتار

ژوورێکی خراپۆکەم لەگەڵ خێزانێکی دەستکورت و کڵۆڵئاسای وەکو ژوورەکەم لە گەڕەکی جیهاددا بەکرێ گرت، ئەو میراتییەی بۆم مابووەوە گواستمەوە ئەوێ، وێنەکەی خۆمم بەدیوارەکەوە هەڵواسی، خەریکبوو بۆ ئەو ساڵانەی لە بینینی دایک و باوک و براکانم بێبەری بووم لە کوڵی گریان بدەم، قەنەفەکانم بەپێی درێژی و پانیی ژوورەکە ڕێک خست و بڕیارم دا یەکیان بەکۆنەفرۆش بفرۆشم، تاکو بتوانم لەو ژوورە تەنگە سێ بەپێنجەدا بجووڵێم.

تۆزی سەر کتێبەکانم تەکاند، کە هێندەی نەمابوو کاغەزەکانی بدڕێن، لە سۆنگەی شێ و پشتگوێ خستنەوە بەرگەکانیان داڕزابوون، دۆن کیشۆت، ڕاگرتنی جێبەجێکردن، هەڕەتی لاوی، خەمی قووڵ، من و سارتەر و ژیان، سەرمایە، هەزار و یەک شەو، هەر کە کتێبێکم دەکێشا بەوی تردا تۆز لە ژێر ڕووناکیی خۆرەکەدا بەئاسماندا دەچوو، هێرمان هێسەم بەدەستەیێڤسکیدا دەکێشا و ئەنتوان چیخۆڤیش بەمارکس و هێرمان ملڤێلیش بەتۆڵستۆیدا، پرسیارم لە خۆ دەکرد داخۆ ئەم سندووقە کلۆمکراوەی دەبێت قفڵە ژەنگاوییەکەی بشکێنم چی تێدا بێت؟ هیچم نەبوو ئەو تەلیسمەی پێ بشکێنم، کە خێزانەکەم بۆی جێ هێشتبووم، تەنانەت بیرم نایەت سندووقێکی وامان لە ماڵدا هەبووبێت، ئەو ڕۆژانەیشی لەگەڵیاندا ژیام هەرگیز شتی وام نەبینیبوو.

دابەزیمە شەقامەکە، مەودای پتر لە پێنج سەد مەتر ڕۆیشتم و بەدەم ڕێوە بۆنی ئازادیم هەڵدەمژی، بەرەو ڕۆژنامەی (طريق الشعب) کەوتمە ڕێ، کە فرۆشتنی لە کوشکی ڕۆژنامە و کۆوارەکاندا بووبووە شتێکی ئاسایی، دوای ئەوەی بەدەستی کێوە بیانگرتایا مانای مردن و توانەوەی لە ئەستێڵکی

کوشتندا دەگەیاند و کەس نەیدەزانی خوێنەرەکەی چی بەسەر دەهات.

وادیارە هەمـوو ئەوانەی کـاتـی خـۆی دەیانناسـیـم و لەگـەڵمـدا بـوون، بۆ هەندەران ڕۆیشـتـوون، یاخـۆ مـردوون، یانیش لە شـوێنـێکدا دوور لە یادەوەری ون بوون، دووریش نیـیـە بوونە خـواردنـی ئەو گـۆڕە بەکـۆمـەڵانەی دوای ڕووخانـی دیکتاتۆر دۆزرانەوە.. کەس نامنـاسێت، چون لێرە لە بـەغدا نەژیابم، گوێم لێیە یەکێک دەڵێت:

– ناوێکی وام لەبیرە، لێ کەی بوو؟ نازانم.

وام زانی ئەوی دەیبـینـم خـەونە و ئەمـین هاشم بەیتـاریش جگە لە درۆیەک زیاتر هیچی تر نییە، کە ئاوەزم لە سـاتەکانی شێتـییـدا دروستی کردووە، درۆیەک ڕۆژ لـە دوای ڕۆژ گـەشــە دەکـات، تاکـو گـەورە بوو و لـق و پۆپ و پوولەکەی لێ ڕووان، هەینێ ویستم بەپەنجەکانم بیگرم، لەگەڵ بادا بەباچوو، هەر یەکێک لەوانەی لەوێ بینیم دەتگوت ئیمپراتۆرێکە بەسـەر کەژاوەوە و لە سەرم بڵندترە، منیش لە نێویاندا پرسیاری شتێلێک دەکەم بەلای هیچیانەوە گرینگ نییە، گوێم لە گڤەی با بوو بەر کاسەی سەرم دەکەوت، ڕۆژەکە تاریک داهات، بەتێکشکاوی و واقـوڕمـاوی دەرچووم، نـازانم چۆن پاشـمـاوەی ژیانم بەڕێ بکەم، لە کاتێکدا هەموو شتێکم لە چاوترووکانێکدا لەدەست چوون.

– ڕەنگە شایانی ئەوە بم، من بووم ئەوی لەسەر شـاشەی تەلەفزیۆن گوترا، وتم.

ئەو مێـژووەی لە ڕێگەی تێکۆشـاندا تێیدا ژیام، لە پشـتمەوە خـۆی گرمۆڵە کرد، ئەم وشـەیە چەند ڕەنگ زەرد و نەساغ هاتە بەرچاو و هیچ جیاوازییەکی لەگـەڵ هەریسـەدا نـەبوو، کە بەکـۆمـەڵ دێن و بۆ هـەریسـەکە دەگـرین نەک بۆ حوسێن، داوەتێک لەسەر کۆپەلانی وشتر، هەینێ دەلەرێتەوە و ئەم حزب و ئەو حزبت پێ دەکات، نازانیت کەنگێ لە بان پشتی دەکەویتە خوارێ، لە پڕ بووینە خـودان سـەدان حـزب و ڕۆژنامـە و گـۆوارەکـانیـشـمـان هەر بەسـەدان، شـەمشـەمـەکوێرەکـانی شـەو و پاڵەوانانیش لە گـشت بـابەت و جـۆرێک،

شەکانەوەی باڵی دروشمی حزبی داد، چرا و دەنووکی هەڵۆ دروشمی حزبی داهاتووە، دیواربەندەکەی جەواد سەلیم دروشمی حزبی ڕەفاهە، پاشان قەرەجێکی کوتراو بەدڵێکی پێکراو بەتیر دروشمی حزبی خۆشەویستی و لێکگەیشتنە، ژیان بووەتە شتێکی تر جیا لەوەی چاوەڕوانی بووین، ژیانێک ڕەش و سپیی لە ژەهراو هەڵکێشراو، ئەمە ئەو وڵاتە نییە، کە ڕۆژێک لە ڕۆژان من تێیدا ژیام و لاویم تێدا بەسەر برد، وادیارە ئێمە لە دوا بەشی دڵنیابوونین، قومقومۆکێک بەنێوان لۆچەکانی چەفتە و عەگالەکەدا دەڕوات، جیهانێکی شێت، بەدگۆڕاو، وڵات لە ژانێکی سەخت و گراندایە، لە ساڵانی کەساسیدا ئارامیی لەبەر بڕا و نەیدەزانی چۆن تۆڵەی خۆی بکاتەوە، لە ناو ئەو سەد حزبەدا هەر حزبە و بیر لەوە دەکاتەوە چۆن لرفەی ئاگردانەکە دامرکێنێتەوە، کە خەریکە دەتەقێت و دوای ئەوە جگە لە ڕووڕەشی و قوپانی سەری خەڵکەکە لە شەماعییەیەکی گەورە و بەریندا، کە بەتەواوی بووەتە نیشتمان، هیچ شتێک نامێنێتەوە.

لەسەر سەکۆی پاشماوەی وێرانەیەک دانیشتم لەفەیەکی فەلافل بەچایەوە بخۆم، قاپێک پیاز و نانێک بەتەنیشتمەوەن، ئەو دەرۆزەکەرە لەڕ و لاوازە بزەخەنە گرتوویەتی، پێم گوت:

– بەخێر هاتی.

کەچی پێی پێکەنیم و گوتی:

– بەخێر بێم؟ باشە ئێمە چ کاتێک لە خێردا بووینە؟

هەستکردن بەئازادی و بۆنەکەی، کە ئەم بەیانییە بەلووتمدا هات، لە ناخمدا دامرکایەوە، سەرە بچووکەکەم بووەتە دوو لەتەوە، لە شێتییەکەم دەترسێم، چی بکەم ئەگەر گەڕایەوە سەرم و تووڕی هەڵدامە خەرەندە قووڵەکەیەوە؟ خۆم بدەمە چ پەنایەکەوە، تاکو ڕوحم لە هەڵچوونەکەی ڕزگار بکەم؟ وا فەلافل بەچایەوە دەخۆم، گوێم لە گەداکەیە لەودەمی دەڕۆیی دەیگوت:

– خواردنەکەت لە حیسابی منە، بەخێر هاتی.

داخوا تا ئەم ڕادەیە نەبوونیم پێوە دیارە؟ سواڵکەرێک پارەکەم بدات؟ نا،

بگرە دنیا گۆڕاوە و لنگەوقووچ بووەتەوە، چوومە لای کتێبفرۆشەکەی کتێبی (لە بێدەنگییەوە بۆ دەنگ)م لا کڕی، نرخەکەیم پێ دا دوای ئەوەی دوو هەفتە دواکەوت، کەچی ڕەتی کردەوە پارەکەم لێ وەربگرێت، کتێبێکی تری وێدام و وەکو دەرۆزەکەرەکە گوتی:

– ئەمەش لەسەر حیسابی منە، بڕوام نەدەکرد بێیت، مادام هاتیت بەڕاستی مەرد و حەڵاڵزادەیت و شایانی کتێبێکی گرانبەهاتریت.

بەو قسانەی کابرای کۆنە کتێبفرۆش زۆر دڵخۆش بووم، ئەمە چ بەخششێکە، لە سەرووی هەموو ئەمانەشەوە زۆرم لێ دەکات کتێبێکی تریش ببەم، ناونیشانەکەی دەخوێنمەوە و لەگەڵ (شەوی ولات) و جەنان جاسم حلاویدا بزە دەمگرێت، خەریکە ئەوی لە بەغدا ڕوو دەدات ناچێتە مێشکمەوە، خەڵکەکە نازانن چی بکەن، دڵخۆشن بەڵام، شتێک هەیە ئەم خۆشییە دەپێچێتەوە، شتێک دەسووتێت، وابزانم مێشکمە، کە لە نێوان چاکە و ئەو ناتەواوییانەی لە تاقە ڕۆژێکدا گووزەرانم لەگەڵیاندا کرد، ئەمبەر و ئەوبەر دەکات، خۆم لەسەر جامی دووکانی سەرتاشەکەدا بینییەوە، گشت شتەکان ماقووڵن، جلەکانم و قەڵافەتم و هێمنییەکەم.

چەکوشێکم کڕی و گەڕامەوە ژوورەکەم، لە ناو پاسەکەدا چەند لاپەڕێکم لە (شەوی ولات) خوێندەوە، ئەو ڕۆمانەی چارەنووسی مرۆڤەکان تێیدا ئاوێتەی یەکتر دەبن و قەدەریشیان تێکەڵ، بۆیە ژیان دەبێتە هێزێکی بەلەسە و ململانێ لەگەڵ تاریکیی مەرگ و مەرجە تێکشکێنەرەکانیدا دەکات، زیندان و سەربازگە و شەڕ، داستانێکە لە ڕێگەکانی دۆزەخ، وادیارە لایەنێک لە ژیانی دانەر خۆی دەگێڕێتەوە، ئەو قسەیەی دوایی ڕۆمانەکەم زۆر بەدڵ بوو، کە دەڵێت:

– شەڕەکان کۆتاییان نەهات، چونکە شەڕەکان دواییان نایەت؛ وەکو ئەوەی جنۆکە زاوزێ دەکەن، بۆیە خەڵکەکە شاری بەسرەی نەفرەت لێکراویان جێهێشت، تەنانەت سەگەکانیشی لە ژیان لە ئامێزی مردندا وەڕس بوون و سەریان هەڵگرت بۆ ئەو شوێنەی بتوانن تێیدا هەناسەیەکی پاک هەڵمژن.

بەسرەم بیر کەوتەوە، دەریای عەرەب، شەقامی "الوطني"، گۆڕەپانی ئوم برووم، سینەما کەرنەک و شەربەتفرۆشەکان، بازاڕی هیندییەکان و دووکانەکانی عەنبە و بەهارات، شەقامی عەشار، ئەو کۆڕنیشەی لەگەڵ خەونە بەدی نەهاتووەکانماندا درێژ بووەتەوە، چەند هاوەڵم لەو شەڕانەی ناچاریان کردین لەوێ سەریان نایەوە چەکوشەکە لە دەستم کەوتە خوارەوە و لەو تاسەیەی بێدار کردمەوە، کە تێپەڕی و لەوێ لە نێوان بەسرە و خەمەکانیدا سەقامگیر بوو.

بەحەسرەتی ئەو سندووقە دارینە قورسە بزمار ئاژنە زەردە گەورەیەوە بووم، دوای چوار چەکوش پێدا کێشانی توند قفڵە ژەنگاوییە بێ کلیلەکەی شکا، لە نهێنیی ترسی ئەوی دەیبینم نەدەگەیشتم، وام دەزانی مار، یاخۆ دووپشک لە بنی سندووقەکەدان و بەیەکجا شالاوم بۆ دێنن، ترسێک تێکەڵ بەخۆشیی دۆزینەوەی شتی گرانبەها، یان بەستەیەک پارە، بەر لەوەی دەستی بۆ ببەم و بیکەمەوە، زۆرم بیر کردەوە.

شتێکی کتوپڕ ڕووی نەدا، هەینێ هیچ شتێک لە ناو سندووقەکەدا نەبوو، بەڵکو بێ هیواییەکی بێ وێنە بوو، چون یەکێک گشت شتێکی دۆڕاندبێت و بکەوێتە سەر ساجی عەلی، وەکو کەسێک لە پانتاییی دەریایەکی هەڵچوودا ڕەشەبای لێ بدات، سەیری بۆشاییی ئاسمان دەکەم و خەریکە بڕوا بەخۆم نەکەم، چۆن دەبێت ئەم سندووقە گەورەیە بەتاڵ بێت، عەبدولعەزیزی دراوسێمان سوێندی خوارد نەیکردووەتەوە و نازانێت چی تێدایە، تەنانەت لەگەڵ دزەکانیشدا بەشەڕ هاتووە، تاکو لێیان بسەنێتەوە، دووریش نەبوو لەپێناو سندووقێکی بەتاڵدا بکوژرێت، قامکەکانم درێژ کردن و چی درزێکی تێدابوو پەنجەم پێدا هێنان، چون لە شتێک بگەڕێم پێوەی نووسابێت، ماقووڵ نەبوو خێزانەکەم سندووقێکی ئاوا بەتاڵم بۆ جێ بهێڵن، تەنانەت لەوەش قورسترە بیر لە هەڵگرتنی بکەیتەوە، یاخۆ هەڵی بگریت بێ ئەوەی سوودی لێ وەربگیرێت.

***

ئەو سندووقـە مـايەی سـەرسـوڕمـان بوو، وەک ئەو حـزبەی سـەر بەو بووم، هەمـوو شـتـێک لـە ژیانمدا بـووەتە بۆشـایی، سنـدووقـەکـەم داخـسـت و لە گۆشەیەکی ژوورەکەوە دامنا، دوای ئەوەی تەنوورە و عەبا و هەندێک چەرچەفم تێ هاویشت، بیرم کردەوە (سبەینێ ئەم شتانە دەفرۆشم و لە کارێکی گونجاو دەگەڕێم).

قـەنەفـەکـە هەر بەخـۆی جـێگەی نووسـتنمـە، هەروەهـا ئەو شـوێنـەی لێی دەخوێنم، بووەتە ژووری من، هـەر لە ئامێزیدا بێدار دەبمەوە و دەنووم و خەون دەبینم، لەوی ڕووی دا ڕادەمێنم و دووکەڵی جگەرەکەم بەبا دەدەم لەسـەر هەر بیـرۆکەیەک جێم بهـێـڵێت، یاخۆ بۆم بێت، لەسـەر ئـەو قەنەفـەیەی بوومـەتە بەشـێک لێی ڕادەکـشـێم، دەبێ بەدرێژاییی ئـەو سـاڵانـەی من بـەزەڕین و گریانـەوە بردمـە سـەر، چی بـەسـەر ئەم وڵاتەدا هاتبـێت؟ چی ڕووی دا و چۆن ڕووی دا و کـەنگێ ئەمـە ڕووی دا؟ مـەبەسـتـم ئەوەیە لە بزریی من چی ڕووی داوە و چۆن و کەی بیزانم؟ بەغدا لە چ نهێنییـەکدا ژیاوە و لەو دەمـەوەی من دوور بووم لێوەی چ تاوانێک گرتوویەتییە خۆی؟ ئەی هاوڕێکانم لە کوێن؟ چۆن بتوانم پرسیاری ئەوانە بکەم، کە ماون؟

نۆی نیسان بەلای منەوە سەرەتایە لە سفرەوە. وەک ئەوەی ئێستا هاتبێتمە دنیاوە و باجـەکەی چی بێت لە خـەم و مۆتەکە هـەر دەبێت بیگووزەرێنم، بەهەر حاڵ ژیانی منە و دەبێت هەر بەشێکی خورابێت نۆژەنی بکەمەوە.

بۆ سـەرلەبەیانی توانیم میـراتی خێـزانەکەم بفـرۆشم، دەگـریام بێ ئەوەی فـرمێـسک بۆ کـاتژمـێـرەکەی بـەزنجیـری زێڕەوە بوو هەڵڕێژم، گـەلێک پارەم بەدەست هێنا لەگـەڵ کـۆمـەڵێک خـەم و پەژارەدا، کـە هێـشـتـا بەنێـو پەراسـووەکـانمدا ڕێیـان دەکرد و گاڵتـەیان پێ دەکردم (ئەوە مـێژوو و ناوتە، چۆن دەسـتـت تێ چوو میـراتـی باووباپیـرانت بـفـرۆشـیت؟) خـەریک بوو هاوار بکەم: من جگە لە مـێـژووی کـەران هیچ مـێـژوویـەکی ترم نیـیـە، من شـوانی شـێـتـیی کـەرانم، من یەکـەمین کـەسم فـێـری زەڕین و وەڕین کـرابێت، ئێـوە سـەبارەت بە چ نـاو و مێژوویەک دەدوێن؟ کـەسوکـارەکـەم هیـچ سیپـاڵێکیـان

نەماوە، تەنیا عەباکەی دایکم نەبێت، هەموو ڕۆژێک بۆنی دەکەم، تاقە شتە ناو و مێژوو و گریان و ڕۆژانی منداڵیمی هەڵگرتبێت، لە ژێر تارماییی ڕەشی ئەودا هەموو شەوێک خەو دەمباتەوە و هەر کاتێک ئەو پەپوولەئاسا کەوتە گەڕان بەدەورمدا لە ناخی دڵەوە فاتیحایەکی بۆ ڕەوانە دەکەم، نە ئاتاجی ئەو کۆمەڵە چەرچەفەم و نەیش ئەو ئووتووەی هیچی پێ ئوتوو ناکەم، کە بۆیان جێهێشتووم، گشتیانم هەرزانفرۆش کرد، شتێک نەمایەوە پێویستم پێی بێت، تەنیا ئەو سندووقە بەتاڵە بزماررێژە نەبێت، کە نازانم چی وای لێ کردم نەیفرۆشم.

سەرلەئێوارە چووم بۆ لای عەبدولعەزیزی دراوسێمان، تاکو ئەو پارەیەی بدەمەوە، کە پێی دابووم، کەچی ئەو دەمی قاوەمان دەخواردەوە پێی گوتم:

– ئەمین کەنگێ ئیشت کرد قەرزەکەت لێ داوا دەکەمەوە.

بۆم گێڕایەوە چۆن شتەکانم فرۆشتووە و تەنیا سندووقەکە ماوە، کە بۆش و بەتاڵ بوو، ئێستا ئەوەم هەیە پێی بژێم، بۆیە دەبێت پارەکەی وەرگرێتەوە. کەچی گوتی:

– ئەگەر بەبیرتدا هات سندووقەکە بفرۆشیت، ئەوا لێتی دەکڕمەوە، بەخۆت دەزانیت شتێکی بەنرخی باپیرانە، ئەمڕۆ کەس حەوسەڵەی نییە شتێکی وا دروست بکات.

پاشان درێژەی بەقسەکانی دا و دووپاتی کردەوە:

– خوا ئاگەدارە هیچ شتێکم لەبارەی ئەم سندووقەوە نەدەزانی.

لە بەردەم دەرگە قسەکەی سەراسیمەی کردم:

– بەچەند دەڵێی ئەو سندووقەت لێ دەکڕم.

نازانم چی وای لێ کردم بەچاوی دوودڵییەوە لێی بڕوانم، گوتم:

– ئەگەر بیرم لە فرۆشتنی کردەوە، ئەوا بۆ تۆیە، بڕوا ناکەم لە ژوورێکی بچووکی وەک ئەوەی تێیدا دەژیم، بتوانم بیپارێزم.

لێ لە دڵی خۆمدا بیرم لەوە دەکردەوە تا بتوانم ئەم سندووقە هەر

لەبەرچاوم بێت، تاکو ڕوحی خێزانەکەم لە گۆڕەکەدا ئاسوودە بێت، من شتێک دەپارێزم لە پاشماوەی یادگارییەکانە، ڕەنگە شتێک بگەیەنێت نازانم چییە و پرسیاریشم نەکردووە، چونکە بەدرێژاییی ژیانم لەگەڵیان و لە یەک ماڵدا بووینە، چاوم بەم سندووقە نەکەوتووە.

***

بەلای منەوە ئەو شەپۆلە پڕ لە هەرا و زەنایەی لە ڕۆژانی لاوییەوە منی گرتە خۆ، کۆتایی هات، گومان بناغەی ئەو ژیانەیە دەیگووزەرێنین و ئەوی لەمێژساڵە تێیدا ژیاوین، کە پچڕاوە لە نێوان زەڕین و وەڕین و ئەوزامانەی تژین لە خوێنی چێشتی کوشندە، ئەگەر جارێکی تر بۆم بلوێ بچمەوە ناو هەناوی دایکمەوە، شەرتبێ هەرگیز نەیەمەوە ناو ئەم دنیا نامیهرەبانەوە، کە ئەوها سەرلێشێواوی کردم و وەکو مشکێکی ترسنۆکی بێ دەسەلات فڕێی دامە ناو ئەم هەموو جەلاد و پیاوکوژ و سەربڕ و ڕابردوو خراپانەوە. چەندێک جێی داخە ساڵانێک بەسەرشۆڕی و نواندنی ڕۆڵی گوێدرێژ بەسەرچوو، بەهزری کێدا دەچوو ئەوی لە عێراقدا ڕووی دا هەر بەڕاستی لە دالانەکانی هەواڵگری ڕوویان دا و بەسەدان قەساب هەن مەراقیان کەولکردنی پێستەکەتە، بێ ئەوەی بزانن گوناهت چییە و تۆمەتەکەت چییە، کە لەسۆنگەیەوە کەوڵتیان کرد؟

هەموو شتێک تەواو، هەر شتێک بێت دەیکەم، بەڵام بیر لە حزبەکان و فریودانە پێکەنین هێنەرەکانیان ناکەمەوە، ئەمە وڵاتێکە تەنیا بێدەنگی و مانەوە لە دوور وێرانە ڕەونەقدار و دیپلۆماسییەتە ساختەکەی و ئەو ئازادییە سەرکوتکەر و لە هەمان کاتدا سەرکوتکراوەی، بەم ئاوایە ئەو چەند ساڵەی لە چوونە ساڵەوە و پیریدا ماوەمە دەیانبڕم و دەڵێم ماڵئاوا، تەنانەت لە ڕۆژنامە و هەواڵەکانی جیهانیش، ئیتر ناتوانم ئەو ڕوحە بشێوێنم، کە دەردیسەری زۆری تووش هات لە پەککەوتن و هاڕین و ماڵوێرانی، دوور نییە ئەم وڵاتە جێهێڵم و نەگەڕێمەوە بۆی، لەوێ لە هەر وڵاتێکی تردا دەمرم وڵاتی خۆم نەبێت، لە گۆڕستانی غەریبان و لەبیرکراوان، گۆڕستانێک کەس سوورەتی فاتیحەی

تێدا بەسەر ڕوحی ئەمین هاشم بەیتاردا نەخوێنێت، لەوێ هیچ ناوێک لەسەر کێلە مەڕمەڕەکە نییە، ڕەنگە لە بناغەدا هەر بوونیشی نەبێت، گۆڕێک لە نێو هەزاران گۆڕی لەبیرکراودا، لە شوێنێک جگە لە مردووان کەس بیری لێ ناکاتەوە و پێی نازانێت.

دوا ماڵوێرانی هات، ئەوەتا ئێمە لەسەر وێرانەی وڵاتێکداین بڕیاریان دا لە لیستی کامەرانی بیسڕنەوە و دەستیان بەسەر مێژوو و سامانیدا گرت، دوای ئەوەی بەیۆرانیۆم زەوییەکەیان سووتاند و کشتوکاڵ و گوانی ئاژەڵەکانیان وشک کرد و چۆلەکەکانیشیان کوشت، کاولبوونە، میراتی ئەو دەسەڵاتدارەیە، کە ڕق و کینەی لە هەر گەردێکی گڵی ئەم نیشتمانەدا چاندووە، سی و پێنج ساڵ لە هەڵەکردن، سی و پێنج ساڵ لە میلیتاریزەکردنی ژیان و پەراوێزخستنی ویژدانەکان و سووککردنی مرۆڤەکان، بەدەیان ساڵ پیاوی شیاو لە جێگەی نەشیاو، پیاوی نەشیاویش لە شوێنی شیاو، دوا ماڵوێرانی هات، لێگەڕێ با کەناڵە ئاسمانییەکانی جیهان پێمان ڕابوێرن، لەوە ئاسەسازتر نییە، کە ڕەگەزێکی مرۆیی کوێرکەیتەوە، بەدرێژایی بیست و چوار کاتژمێر لە ڕۆژێکدا لە کوشتنی خۆڕا (ڕەنگاوڕەنگ) پڕ چێژتر نییە.

ئەوی مایەی سەرسوڕمانە ئەم هەموو هاندانە بەخۆڕایی دەبینیت، لەو دەمی چای دەخۆیتەوە، یاخۆ قاوە لەسەر قەنەفەیەکی خۆشیبەخش فڕ دەکەیت، لە بەرابەرت لاشەی عێراقییەکان بەڕاست و چەپدا بڵاوبوونەتەوە، پارچەکانیان لای ڕۆژئاوا و ئەندامە بڕاوەکانیان بەلای باشووردا، کەسیش تەلەفزیۆنەکە ناکوژێنێتەوە، چونکە تەماشاکردنی مەرگ بەدرێژایی ڕۆژانی شەمە و دووشەم بەخۆڕاییە، بێ ئەوەی لە ڕۆژانی یەکشەمە و چوارشەمەشدا کەس بیانخاتە کەوانەی باسکردن و یادگارییەوە، ڕۆژانی هەینی و سێشەمەیش پشوو نین، هەرچی ڕۆژی پێنجشەمە ئەوا شەوئاهەنگە تاکو بەیانی، لەگەڵ کوشتوبڕێک سەرکردەکانی گۆی زەوی بەجلی ئاهەنگە فەرمییەکانەوە بەشداریی تێدا دەکەن.

## کۆتاییەکان

سەفیە دیسانەوە گەڕایەوە نەخۆشخانەی شەماعیە، عەفرای هاوەڵی بەخۆی بردی بۆ ئەوێ، پاش ئەوەی ئەپارتمانەکەی لە داخ مشکێک، هەر بوونی نەبوو سووتاند، گەڕایەوە هەمان شوێن (بەنەخۆشی)، کەس زۆری لێ ناکات شتێک بکات، کەسیش شەڕی پێ نافرۆشێت، یاخۆ بەزۆر دەستدرێژیی بکاتە سەر، ئەوی مایەی سەرسوڕمان بوو زۆر پێدەکەنی، بەشەو و بەڕۆژ دەخەنییەوە، ئەمەش مانای ئەوەیە پاشماوەی ژیانی لە دۆخی کامەرانیدا بردەسەر، لەوێ لە هۆبەی ٩دا گیرسایەوە، کە بووبووە بەشێک بۆ شێتە دەستنەوەشێنەکان، ئەمجاریان دوور لە پیاوانی هەواڵگری، یاخۆ دەستدرێژیکەران و جەلادان، لە هەمان هۆبەدا بێ ئازار، یان هەستکردن بەترس، سەری نایەوە.

ئەو ڕۆژەی سەفیە کۆچی دوایی تێدا کرد، هەندێک وشەیان لە ژێر سەرینەکەیدا دۆزییەوە لە شوێن چرنووکی پشیلەیان دەکرد، لە کاغەزەکەدا نووسرابوو:

– چاڵ، دواییەکەی چاڵە!

کەس لە نەخۆشخانە سەری لێ نەدا و کەسیش مردنەکەی بەهەند نەزانی، لە گۆڕستانی کەرخ لە بەشی بێ ناونیشان و سەرگەردانەکان ناشتیان، بێ ئەوەی کێلێکیان هەبێت ئاماژەیان پێ بکات، شەقامەکانی بەغدا لە ژێر تەرمی بەسەر یەک کەوتوودا دەیاننالاند، دۆخەکە لە نەجەف و فەلوجە و سامەڕاشدا هەر وابوو، ئاگر و هیس، کەس ئاوڕی لەوە نەدەدایەوە تا ببینێت وڵات چی بەسەردا هاتووە، تەنیا نەخۆشخانەی شەماعیە بوو لە هۆبەی ژمارە ٩دا خەڵکانێکت دەبینی تێیدا پێ دەکەنین، تا ئێستاش وێرای شێتی، کەسێک لەسەر دیوارەکانی نووسیوە و دەڵێت:

- ئەم هەموو مەینەتییە لەپای چی؟

***

ئەسعەد سەعید فەرحان، ئەمین هاشم بەیتاری هاوڕێبازی نەدۆزییەوە، چوو بۆ دیمەشق و لەوێ هاوەڵانی تاراوگەی قایلیان کرد دوای جێبەجێکردنی کاغەزەکانی بڕوات بۆ ئەمستردام، لەوێ لە وڵاتی ئاو و گوڵدا شتێلێکی بینی تا کۆتاییی ژیانی ناچاری مانەوەیان کرد، هەموو جارێکیش بەتاسەوە بوو بۆ بەغدا، ئەوی لە کونجە تاریک و نووتەکەکانی کوشتندا بەسەری هات بەبیریدا دێتەوە، ڕۆژ نا ڕۆژێک تەلەفزیۆن دەکاتەوە و جگە لە مەرگ و ڕاوەڕووت و منداڵ و ئافرەت ڕفاندن هیچی تر نابینێت، لە هەر بستە خاکێکی نیشتماندا تەرم دەبینێت، بەڕادەیەک خەریکە لەودیو شاشەکەوە بۆنی بۆگەنییان دەکات، چەندێک بەئاواتەوە بوو بەرێککەوت ئەمین هاشم بەیتار لە هەواڵێکدا ببینێت، ئەگەر لە شەقامێکیش لە شەقامەکانی بەغدایا ڕێ بکات، تاکو بزانێت چی بەسەردا هاتووە و لە مانەوەی لە ژیاندا دڵنیا بێت، دوای ئەوەی ئەو هەموو سووکایەتییەیان بەپیاوەتی و بەناوەکەی کرد، ئەو شایانی ئەوەیە لە هەزار باشیدا بێت، لێ لە شاشەکەدا وادیارە (کەس ئاگای لە کەس نییە).. پەرتبوونێکی ترسناکە، تەنانەت پێشکەوتووترین ئامێری تەکنۆلۆجی ناتوانێت ئەدرێس و تاراوگەکان بدۆزێتەوە، کە هزرمەند و نووسەران و بلیمەتەکان پەنایان بۆ بردوون، ئەوانەی عێراقیان جێهێشتووە و ژیانیان لەسەر ئاخ و داخ بنیات دەنێن، لە حەسرەتەوە بۆ خەمباری و بۆ مەفتوونی و بۆ ئازارێک، لە ئێش و ئازاری کەسانی هیچ شوێنێکی ئەم جیهانە بەرفراوانە پڕ لە ئاسوودەییە ناچێت.

***

تا هەنووکەش ئەسعەد سەعید فەرحان نەفرەت لە ناوەکەی خۆی دەکات، کە جگە لە بەدبەختی و سەرشۆڕی و ئازار هیچی بۆ نەهێناوە، وێڕای ڕزگاربوونی لە گرتووخانەکان و نەخۆشخانەی شەماعیە و لە نەخشەی سەرتاپای وڵات، هێشتا لە ناوەکەیدا ئەوە دەبینێتەوە، کە ژیانی خستە نێو

ئەو جــەلادانەی ســـواری بوون و ئەوانەی ناچاری گــوێگرتن لە زەڕینی خــۆشــەویســتــتــرین کــەســیــان کــرد، زەڕینێکی پڕ لە ژان، لە ئاهەنگی لاقەکردنەکەی لە بەردەم هاوزیندان و باوکە ڕوحـیـیـەکـەی پتـر ئازاری پێ گەیشت.. ئەو کورتەبنە قەڵەوەی دێتەوە یاد، کە کەوڵی کرد و لەبارەی ئەمین هاشم بەیتارەوە دەیگوت:

– تەماشا بکە و چێژ وەرگرە، هەی بەناز، ئەمە ئەو ڕابەرە لێهاتووەیە دوای کەوتن، باش سەرنجی بدەیێ، داخۆ کەری لەمە چاکترت بینیوە؟ زەڕینی لەمە خۆشترت بینیوە؟

لێرە لە ئەمستردام مۆتەکەکانم لە کۆڵ بوونەتەوە، دەزووەکانی دواییان هات، دوای ئەوەی مــەودای نێــوانی لەگــەڵ ڕابردوودا درێژ بووەوە، هــەرچی ناوەکەیەتی، هەستی نەدەکرد بەختەوەرترین بەختەوەرە لە جیهاندا، تەنیا ئەو ڕۆژە نەبێت دیکتاتۆری لابراوی بینی لەو چاڵە دەریان هێنا، کە تەنیا جێگەی مـشک و سـیـسـرکـە بوو، ئەو شـوێنەی لە هەر یەکـێک لە کـۆشـکە ڕازاوە سەختەکانی پتر تێیدا ژیا.

***

تا ئێستا محەمەد جەمیل سوێرکی لە (عەینل حیلوە)یە لە لبنان، هەر لەو چادرگەیەدا دەمێنێتەوە، کە منداڵی و لاویی تێدا بەسـەر برد، بۆ هیچ وڵاتێکی عەرەبی ناچێت (ئەمە دوا بڕیارە، گەڕانەوەی نییـە)، ئەو ترسـەی بەسـە، کە تێــیــدا لەودیو تەلدڕ و شــووراکــانی بەغــداوە ژیا، ئەوەندەی بەســە لە گەنجێتییەکەی لە ژێرزەمینەکانی مەرگدا لەدەستی دا.. ئەو بەچاوی خۆی بینی چۆن مرۆڤەکان لە ئاژەڵەکانی دارستان دڵڕەقتر دەبن، ئەگەر خۆیشی لەبیر بکات، ئەی چۆن سەرهاتی محەمەد ئیدریسی و خەلیل عەباس شناوەی بیر دەچێت؟

ئەوی مایەی سەرسوڕمانە هیچ یەکێک لە دەوروبەرەکەی بڕوا بەسـەرهاتی خۆی، یاخـۆ سەرهاتی ئیدریسی ناکات، پەردەیەک هەیە بەرچاوی هەندێکی گرتووە ناهێڵێت ڕاسـتـیـەکـان ببـینن، تەنانەت ئەو گۆڕە بەکۆمـەڵانەی

تاوانەکانی ئەو ڕێژیمەیان ئاشکرا کرد، بەفێڵیان لە قەڵەم دا، گوایا بۆ ئەو فەرمانڕەوا سەرشۆڕەیان ڕێک خستووە، کە ئەو ڕۆژەی لە چاڵەکەی هێنایانە دەرێ خستنیە گریان.. بۆیە محەمەد جەمیل سوێرکی ئیتر سەرهاتەکەی بۆ کەس نەدەگێڕایەوە، هەروەها لەوەدوا قسەی لە هەمبەر ژنەکەیەوە نەدەکرد، کە چی بەسەردا هات، هەر لە دەستدرێژیکردنە سەری، تاکو سەرشۆڕی و ڕاهاتن لەسەر خواردنەوە، ئەوە چیرۆکێکە ڕەتی دەکەنەوە بیبیستن، یاخۆ دانی پێدا بنێن، بەڵام جەلادەکان کەس نییە باوەڕ بکات، کە ئەوان لە توخمی ئەو ئادەمیزادانەن، کە ئەو لە (عەینل حیلوە)دا باسیان دەکات و لەبارەیانەوە دەدوێت.

لە سۆنگەی ئەمەوە سوێرکی لە قسەکردن وەستا و بەتەنێ بیری لەو بەفیڕۆچوونەی ژیانی خۆی و ژنەکەی دەکردەوە، کە بووبووە پارچەیەکی پشتگوێخراو لە کونجێکی ماڵەکەدا، دوای ئەوەی بەشی حوشترێک مەیی خواردەوە، تاکو ئالوودە بێت و بەدرێژاییی ژیان وەکو سەرخۆشێک کۆتایی پێ بێت.

هەر کاتێک هەواڵێکی پڕ لە ژانی سەبارەت بەپیاوێک ببیستایا تووڕیان هەڵداوەتە زیندانەوە، یاخۆ کەسێک تێر دارکارییان کردووە، دەخەنییەوە، محەمەد جەمیل سوێرکی بەهەر شتێک بوایا پێدەکەنی، یەکسەر لەگەڵ ئەو تەونی جاڵجاڵۆکەیەی بەراورد دەکرد، کە لەوێ بینی، لەو ژوورەی شەو و ڕۆژ نرکەی دەهات، ئێستاش هەر ئەوە دووپات دەکاتەوە:

- خوا یارمەتیت بدات عێراق.

***

عەمار موزهر شێخیان بۆ کەرەڤانێک گواستەوە، تابلێی لە بیناسازی و ڕازاندنەوەدا جوان و قەشەنگ بوو، کە هەر لە ماڵە هاوینە ژاپۆنییەکان دەچوو، لەوێ سەیرترین شتی لە دوای ڕووخانی ڕێژیمەوە بینی، عەفرای ژنی چون یەکەمین جاری بێت بیبینێت لەبەر دەرگە بەشەرمەوە بزەی بۆ دەکرد، عەمار لە خۆشییاندا هێندەی نەمابوو ببوورێتەوە، بەهێوریی کیسەڵێک لە نێو

دڕکوداڵدا بڕوات بەرەو لای چوو، پێش ئەوەی بگاتە لای و بەتاسەوە دەست بنێتە نێو دەستی، گوێی لە دەنگی کاکە فەرزاد بوو بەدەنگی بەرز لەودیو دەرگەکەوە دەیگوت:

– دەبێت مانگی هەنگوینییەکی تر لەم ماڵە دڵڕفێنەدا بەسەر بەرن، پاشان دەتاننێرین بۆ سوید، کەس نازانێت لە کوێ دەژین، ئا لەوێ ژیانێکی نوێ دەست پێ دەکەن.

ئەو ڕۆژانە جوانترین ڕۆژانی ژیانیان بوو لە نێو چیا و درەختە بەئاسماندا چووەکاندا بەسەریان برد، پاشان خەونەکەیان هاتە دی، ئەو ڕۆژەی لە کەشتیکی زریاناویدا چوون بۆ شاری گۆتنبێرگ، پلەی گەرما پێنج پلە پتر لە خوار سفرەوە بوو، ئەو کات پایزێک بوو لە بەهار دەچوو، لە چاوەڕوانیی زستانێکدا بوون کەس نەیدەزانی چۆن لە ژێر بنمیچی ئەو سەرما و سۆڵەدا دەژین.

عەمار موزهر چون منداڵێک فێری وشەی دایە دەبێت، ئاوا فێری زمانی ئەو وڵاتە بوو، کەچی عەفرا لەو وڵاتە چەپەک و دوورەدەستە لە خەمی ڕابردوو، خۆی خەریکی تێگەیشتن لە ژیان کرد و بەعەشقەوە پەیڤی سوێدیی دەوتەوە و ئەمەش یارمەتیی بازاڕی کردن و خوێندنەوەی هەواڵەکانی جیهانی دا، شەوانی زستانیش تەنیا تەلەفزیۆن بوو پێی ڕادەگەیاندن چی لە ژێر گڕی نەوتدا ڕووی داوە، کە لە سەرتاپای عێراقدا ئاگری گرتبوو، وەک ئەوەی لە هاوین و زستاندا ئاگر بووبێتە مایەی ڕابواردنی خەڵک.

عەمار شێخ تاقە شتێک لە تاراوگە بیری لێ بکاتەوە، ئەوەیە کە مێری لە هەمبەر ئاودەستخانەوە گوتی: دروستکراوە تاکو لە پووچیی ژیانمان ڕامێنین، نەک خۆمانی تێدا خاڵی بکەینەوە، هەر جارێک بچوایەتە ئاودەستی ماڵەکەی لە گۆتینبێرگ پێکەنین دەیگرت، عەفراش لێی ناپرسی بەچی پێ دەکەنێت، ئەو حەزی دەکرد بیبینێت بخەنێتەوە، تەنانەت ئەگەر پێکەنینەکەی بەبێ هۆش بوایا.

***

هەرچی ئەمین هاشم بەیتار بوو، کەس ئاوڕی لێ نەدایەوە، خۆیشی پێویستی بەکەس نەبوو، جارێک لە بازاڕ میوە و تەڕەی دەفرۆشت، جارێکیش شۆفێریی پاسە گەورەکانی نێوان عەزیزییە و بەغدای دەکرد، پاشان لەسەر لێخوڕی تەکسێتی سەقامگیر بوو و دوای ئەوەی بڕێک پارەی لە کارە زۆرەکانی پێشووی کۆکردەوە، توانی بەقیست بیکڕێت، کەچی تا ئێستاش بەناوی خوازراوەوە لە ڕۆژنامەکاندا دەنووسێت، تەنیا سەرنووسیار پێی دەزانێت، ئەو کاتی پاداشتە مانگانەییەکانی لە ئەمینداری سندووقەکە بەبریکارنامەیەکی تایبەتی ساختە، کە تێیدا ناوی تەواوی نووسراوە، وەردەگرێت.

وای لێ هات دزێوترین وشە زۆر بەرگوێی بکەوێت، سیاسەت و داڕێژراوەکانی بوو، پاش ئەوەی ناسییان دووبارە بۆ ڕاژەی حزبی شیوعی داوایان کردەوە، کەچی ئەو گاڵتەی بەهەموو شتێکدا دەهاتەوە کاتێک بۆ گەڕانەوەی خستیانە بەردەستی:

– هیچ شتێک لە دنیادا ئەوە ناهێنێت مرۆڤ لە پێناویدا ڕیسوا بکرێت.

هەر کاتێکیش گوێی لەو قسانە دەبوو لەبارەی ئابڕوو و خەبات و بەرەنگاری و بنیاتنانی دواڕۆژەوە، خۆی دەگرت نەکو لە پرمەی پێکەنین بدات، لە بەرابەر گەورەترین بەرپرسیش بوایا تەنیا دەیگوت:

– ئێمە پێویستمان بەسەد ساڵی ترە، تاکو لە سیاسەت بگەین.

بەوەی پێی گەیشتبوو لە ژیاندا قایل بوو، گەلێک شکستی بینی، دۆڕانی شەرمهێنی ویژدان و بەڵێن و ئەو لایەنانەی باس لە شتی زۆر و گەورە دەکەن، کەچی دەروونیان گەلێک لەوە نزمترە، کە دەیڵێن.

تەلەفزیۆن تاقە هۆی ڕابواردنی بوو بەر لە نووستن، لەسەر شاشەکەی دەیبینی چۆن دنیا لنگەوقووچ دەڕوات، بۆیە پتر ئاتاجی عارەقی زەحلاوی بوو، لەسەر شەرەفی ئەو بۆشاییەی دەورەی داوە تا بەیانی دەیخواردەوە، بێگومان ژنی نەهێنا و هەرگیز بیری لە منداڵ هاوردن نەکردەوە، تا بێتە ئەم

کوشتارگەیەی تێیدا ژیا، ئەو هێشتا ئەو وتەیەی مەعەڕیی شاعیری لەبیرە، کە دەڵێت (ئەمە ئەو گوناهەیە، کە باوکم بەرابەر بەمن کردی، بەڵام من بەرابەر کەس نەمکردووە). ئەو ڕۆژنامانەی بەس بوون، کە هەندێک کورتەچیرۆکی تێدا بڵاو دەکردنەوە، لەگەڵ ئەو وتارانەی تێیاندا باسی هەموو شتێکی دەکرد، سیاسەت نەبێ. ئەم قسانە سوودیان بۆی نییە، لای ئەو تەنیا بەشێکی دابڕاو لە ژیانیدا دەگرێتەوە.

دەیتوانی بگەڕێتەوە ئیمپراتۆریای کڕین و فرۆشتن، لەگەڵ شتێک لە خوێنی ڕژاوی لارێکان، ببێتە وەزیر، یاخۆ باڵیۆز، یان بەرپرسێکی گەورە لە هەر دەزگایەکی ڕۆشنبیری، یاخۆ ڕاگەیاندن، یانیش هیچ نەبێت، سەرنووسیاری یەکێک لەو ڕۆژنامانەی، بەشێوەیەک زیادیان کردووە نازانیت کێ دەیانخوێنێتەوە، کەچی گشت ئەو پارە خستنە بەردەم و گەورەییانەی خستنە لاوە.

شۆفێری تاکسی، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت بەئارامی و دڵنیاییەوە دەنوێت، مادام قیستەکانی ئۆتۆمۆبێلەکەی لە تەواوبووندایە و بەبێ قەرز دەچێتە ناویەوە، ئەمەش بۆ ئەو زۆر دەگەیەنێت، لە سۆنگەی ئەوەی سندووقی خێزانەکەی خاڵی بوو و هیچی تێدا نەبوو:

– ژیان دوای ئەوەی ئەم هەموو شتەم تێیدا بینی، لەوە خراپتر نابێت.

***

لە ناو نیشتمانی خۆماندا بووینەتە ئاردی ناو دڕک. ئەسعەد سەعید فەرحان نەیتوانی ئەمین هاشم بەیتاری مامۆستا و خزمی ببینێت، عەفراش نەیتوانی سەفیەی هاوەڵی لە تۆقین و شێتی بپارێزێت، تەنیا بۆشایی ماوەتەوە، بۆشاییەکی سپی لە بۆشاییەکی ڕەشدا وەچەی خستووەتەوە، بۆشاییەکی بێتاوان بۆشاییەکی تاوانکار هێنای، تاراوگە لە ناو تاراوگەدا، پارچە پارچەبوونی ڕوحیش توندترە لە پارچە پارچەبوونی شوێن و مەوداکان.

تەنیا عەفرا مێردەکەی خۆی بەدەست هێنا، کەچی مالیان جێهێشت و بەرەو جیهانێک ملیان نا، تەنانەت ڕۆژانی هاوینیش بەفری تێدا دەباری.. گشت شتەکان کۆتاییان هات، ئەوی مایەوە، تەنیا فرمێسک هەڵڕشتن بوو لەسەر چیای زیانەکان، کە بەدرێژایی مێژووی عێراق بەرزترین چیا بوو، هەموو ئەمانەش بەهۆی هەڵەیەکەوە لە پێکهاتەی ژیان، کە تەماعکارترین کەسی بۆ شکۆ و دەسەلات هێنا، بەشێوەیەک لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن و لە بەرابەر ملیۆنان کەسدا دانی پێدا دەنێت (بەلای ئەوەوە مەرگی دە هەزار کەس شتێک ناگەیەنێت و سمێڵی نالەرێتەوە ئەگەر بەبەرچاوییەوە بکوژرێن).

سندووقی خێزانەکەمانیش بەتاڵ و حەتاڵە و هیچی تێدا نییە.

بۆشاییەک لە ناو بۆشاییەکی بێ کۆتایە، ئەمە سەرەنجامی ئەو ئابڵووقە گەورەیەیە، کە بوو بەمایەی برینی سەر و زڕاندنی خەونەکان و ڕیشەکێشکردنی هەموو ئەو شتانەی بنیاتمان نابوون. سندووقی خێزانەکەشمان هیچی تێدا نییە، کۆچێکی ئەختەبووتییە بەرەو جیهان، وامان دەزانی لەگەڵ ڕووخانی ڕێژیمدا دوایی دێت، کەچی ڕێچکەیەکی تری وەرگرت، ترس تەنانەت لە چوونە قوتابخانە، منداڵەکانیشمان گەمە بەنارنجۆک و گوللە و پارچەی تەقینەوە دەکەن، ژیان پیرۆزیی نەماوە، دارودەستەکەی شەیتانیش لە شاشەی کەناڵە ئاسمانییەکانەوە مرۆڤەکان وەک کار سەردەبڕن، بەکۆمەڵ سەری کەسانێکیان بڕیوە و تووڕیان هەڵداونەتە سەر زبڵدانەکان و لەسەر شۆستەکاندا فڕێیان داون.

بۆشایی لەسەر بۆشایی کەڵەکە دەکات، بەڕاستی وڵات بووەتە وێرانە و هیچ ئومێدێک لەوسەری ئەم تونێڵە تاریک و نووتەکە نەفرەتییەدا بەدی ناکرێت، بەغدا تەنیا بۆشایی تێدا ماوە، لە بەسرە، لە عیمارە، لە ناسرییە، لە موسڵ و کەرکووک، بۆشایی لە ڕوحدا، ڕوح ڤالایە، هەروەها بۆشایی لە سەردا، مێشک لە ژێر بایەکی هەڵکردوودا بەتاڵە، شارە پیرۆزەکانیش لە کوشتن بەدوور نەبوون، کە گەورەکانی لەگەڵ خۆیدا برد و کەلێنی خستە خۆشییەکانی منداڵانەوە، کوشتنی هەڕەمەکی بەشەو و ڕۆژ، هیچ نییە جگە لە

بۆشاییيەكی بەسام و ترسناك و تۆقێنەری وا لە هەر بەڵایەك گەورەترە، كە سەدان ساڵە بەسەرماندا تێپەڕیوە، لێ، ئەمین هاشم بەیتار، تا ئەم ساتەش هەست بەلاوازی دەكات، بەمووچوڕكێك ناخی دەهەژێنێت و خوێنی دەمژێت، هەر كاتێك ببینێت، یاخۆ ببیستێت گوێدرێژێك دەزەڕێت.

عەمان ٥ ٢٠٠

نووسەر لە چەند دێڕێکدا:

- لە ١٩٤٧/٦/٧دا لە بەغدا لە دایک بووە.
- کورتەچیرۆک و ڕۆمان و شانۆنامە و ڕەخنە دەنووسێت.
- زیاد لە ٤٠ کتێبی بەچاپ گەیاندوون، لەوانە (ژیانی شەریف نادر بەکورتی، تکایە گوڵەکە مەدزە، کۆماری قەیرەکان، سندووقی هەڵەکان، شەقامی موتەنەبی، دوای کاولبوونی بەسرە، بازاڕی سەرای، نیوەی خەمەکان، حەکایەتخوان....).
- بەرهەمەکانی وەرگێڕراونەتە سەر زمانەکانی (ئینگلیزی، ئەڵمانی، ئیسپانی، سربی، ڕووسی، کوردی).
- کەلەپووری میللیی میسری لە ساڵی ١٩٧٤دا لە قاهیرە خوێندووە.
- لە ساڵی ١٩٩٩وە لە عەمان نیشتەجێیە.
- سەرهاتی ژیانی خۆی لە چوار بەرگدا نووسیوەتەوە، لە سێیینەی (کۆچ بەرەو دوێنێ) و (ژیانم لە چیرۆکەکانمدا).
- هەموو کاتی خۆی بۆ خوێندنەوە و نووسین تەرخان کردووە.

الشماعية، رحلة في الزمان الخطأ والمكان الخطأ، من أجل ماذا كل ذاك البلاء؟ عندما كتبتها كان لحروفها مذاق خاص، أشبه ما يكون بالبكاء، لم أصدق أنهم رحلوا وأن المحنة لم تتكرر وأن الشماعية ستغلق أبوابها في الزمان الصواب والمكان الصواب.

أسعدني ترجمة الرواية الى اللغة الكردية، ذلك أن بعض أحداثها تدور في كردستان العراق، وكنت أرجو أن تكون (الشماعية) أطول وأعمق من طقوسها وعواطفها ويراكينها وأسلاكها وهواجسها التي جئت بها، لكن المذاق الخاص الذي أوشك أن يبكيني قادني الى الرضا بما حققت، وعلى مضض مضيت مع أبطالي في بغداد وفي كردستان أعيش المحنة التي لا تشبه المحن في كل دروب ومفازات الدنيا. الشماعية غريب أمرها، فقد كتبتها بوقت يشبه العزف على آلة الكمان، كتبتها وأنا أعوم في بحر بارد، لم تأخذ مني سوى شهور، وعندما فتحت النافذة في أول الشتاء كانت قد انتهت، مبللة صفحاتها بالجروح، غريب أمرها حقاً، إنها أول رواية في حياتي أعزف فيها وأبكي وأول رواية أكتبها وأنا خارج حدود جسدي، أسأل نفسي: من أجل ماذا كل ذاك البلاء؟

عبدالستار ناصر



چاپخانەی
ئاراس
هەولێر - کوردستان
Aras Press
Kurdistan - Erbil